محوی 2

# ژیانی چوار پێشەواکەی ئیسلام

ئیمامی

## (شافعی) (ئەبو حەنیفە) (مالك) (ئەحمەد)

خوا لێیان رازی بێ


داناني

ئارام عبدالله



چاپی سێیەم 2010








# ژیانی
# چوار پێشەواکەی ئیسلام

## ئیمامی

## شافعی ، ئەبو حەنیفە ، مالك ، ئەحمەد

## خوا لێیان رازی بێ

دانانی

ئارام عەبدوڵڵا

# بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين ، و الصلاة و السلام على سيد المرسلين و إمام المتقين ، سيدنا محمد و على آله و صحبه أجمعين ...

أما بعد ...

خوێنەری ئازیز : هەموومان دەزانین کە چوار ئیمامە گەورەکەی سەرمەزهەبەکان رۆڵێکی گرنگ و بەرچاویان بینی لە بلاْوکردنەوەی ئەم ئاینە پیرۆزە ، بەلاْم زۆربەی زۆرمان بەتەواوی ژیان و بەسەرهاتی ئەم رێزادارانە نازانین و ئاگادار رووداوەکانی سەردەمی ئەوان نین ، بۆیە بە پێویستم زانی ئەم چەند لاپەڕەیە بنووسم لەسەر ژیان و بەسەرهاتی ئەم چوار ئیمامە بەرێزە ، بە ئیمامی شافعیم دەست پێکرد چونکە زۆربەی خەڵکی کوردستان لەسەر مەزهەبی ئەو بەرێزەن .

لەخوای گەورە دەپاڕێمەوە ئەم کارەم قەبوول بکا و لە من و دایك و باوك و مامۆستا و خۆشەویستانم خۆش بێ ... آمین .

# ناوی ئیمام

ناوی موحەممەدی کوڕی ئیدریسی کوڕی عەبباسی کوڕی عوسمانی کوڕی شافعی کوڕی ئەسسائیبی کوڕی عوبەیدی کوڕی عەبد یەزیدی کوڕی هاشمی کوڕی عەبدولموتتەلیبی کوڕی عەبد مەنافی کوڕی قوصەی قورەشی موتتەلیبی شافعی حیجازی مەککیە ، لە باپیرە گەورەکەی عەبد مەناف دەگاتەوە پێغەمبەر ﷺ ، کونیەکەشی : ئەبو عەبدیللایە .

نازناوی شافعی لە باپیرە گەورەکەی ( شافع ) بۆی هاتووە کە بە بچووکی پێغەمبەری ﷺ بینیوە و ئەسسائیبی - باوکی شافع - لەدوای جەنگی بەدر موسڵمان بووە .

دایکی ئیمامیش لە تیرەی ئەزدە و ناوی : فاتیمەی کچی عەبدوللای کوڕی ئەلحەسەنی کوڕی ئەلحوسەینی کوڕی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی تالیبە خوا لە هەموویان ڕازی بێ .

# لەدایک بوونی

لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ١٥٠ی کۆچی لە شاری غەززە ئیمامی شافعی لەدایك بووە ، هێشتان تەمەنی زۆر بچووك بوو کە باوکی وەفاتی کرد ، کە گەیشتە تەمەنی دوو ساڵی دایکی ناردیەوە شاری مەککە تاوەکو لەوێ گەورە بێ ، کە لە شاری مەککە نیشتەجێ بوو و تەمەنی گەیشتە حەوت ساڵی قورئانی پیرۆزی لەبەر کرد و لە تەمەنی دە ساڵی هەموو موەتتەئی ئیمامی مالکی لەبەر کرد !!

لەسەرەتاکانی تەمەنی زۆر حەزی لە شیعر و ئەدەب بوو ، بەلام روو تێکردنی بۆ زانستی ئاینی لەبەر چەند هۆیەك بوو کە ئەمانەن :

١- موصعەبی کوڕی عەبدوللای زوبەیری فەرموویەتی : ئیمامی شافعی لە سەرەتای ژیانی زۆر حەزی لە شیعر و رووداوەکانی عەرەب دەکرد ، رۆژێکیان لەگەڵ قوتابیەکی باوکم لەسەر ولاغێك بوون ، لەناکاو ئیمامی شافعی دێرە شیعرێکی وت، قوتابیەکەی باوکم پێی وت : یەکێکی وەکو تۆ خۆی بەم جۆرە شتانە خەریك دەکات !! بۆچی خۆت لە (فقه) شارەزا ناکەی ؟!

٢- ئیمامی شافعی فەرموویەتی : لەسەرەتای ژیانم زۆر حەزم لە شیعر بوو ، رۆژێکیان لەسەر جێگایەکی بەرز دەرۆیشتم لە مینا ، لەناکاو گوێم لە دەنگێك بوو لەدواوەم لەیوت : خۆت خەریك بکە بە (فقه ) و شەرع !

کە ئاوڕم داوە کەسم نەبینی !!

٣- ئیمامی حومەیدی فەرموویەتی : ئیمامی شافعی فەرمووی : جارێکیان موسلیمی کوڕی خالیدی زەنجی منی بینی و لێی پرسیم : تۆ خەڵکی کوێی ؟

وتم : خەڵکی مەککەم .

فەرمووی : ئێستا لە کوێ دادەنیشی ؟

وتم : لە خەیف[1] .

فەرمووی : ئەی لە چ تیرەیەکی ؟

وتم : عەبد مەناف .

فەرمووی : بەخوا شتێکی چاکە ! بەراستی خوای گەورە شەرەف و گەورەیی پێ بەخشی ... بۆچی ئەو تێگەیشتنەت بۆ (فقه) و شەرع تەرخان ناکەی ... ئەی بۆ تۆ باشتر نیە ؟!!

---

[1] شوێنێکە لە شاری مەککە .

لەبەر ئەم هۆیانە ئیمامی شافعی رووی کردە زانستی ئاین و لە خزمەت ئیمامی موسلیمی کوڕی خالید دەستی کرد بە داواکردنی زانست .
بەلاّم لەبەر دەست کورتی وهەژاری زۆر بە زەحمەت ئەیتوانی داوای زانست بکات ،
بەلاّم هەر خۆی فەرموویەتی : هەر کەسێ داوای زانست بکات بەهەژاری و خزمەت کردنی زانایان زۆر چاك فێر دەبێ .
بەم حاڵە ئیمامی شافعی لەلای ئیمامی موسلیمی زەنجی دەستی بە خوێندن کرد ، تا لە تەمەنی پانزە ساڵی موسلیم رێی پێدا فەتوا بدا و پێی فەرموو : ئەی موحەممەد : فەتوا بدە ، بەراستی تۆ شایەنی فەتوا دانی !!!
ئینجا چووە لای ئیمامی مالك لە شاری مەدینەی پیرۆز ، بەلاّم پێش ئەوەی بەرێ بکەوێ بۆ مەدینە چووە لای والی[2] شاری مەککە و داوای لێ کرد نامەیەك بنووسێ بۆ ئیمامی مالك ونامەیك بۆ والی شاری مەدینە تاوەکو یارمەتی بدات بچێتە خزمەت ئیمامی مالك .
لەبەر ئەوەی والی مەککە ئیمامی شافعی زۆر خۆش دەویست داواکاریەکەی جێبەجێ کرد ، ئیمام بەدڵ خۆشیەوە بەرێکەوت بۆ شاری مەدینە .
کە گەیشتە ئەو شارە هەردوو نامەکەی دا دەست والی شاری مەدینە ، کاتێك والیەکە نامەکەی خوێندەوە ، سەیری ئیمامی شافعی کرد وتی : کوڕی شیرینم : سوێند بەخوا ئەگەر والی مەککە داوای لێ کردبوومایە لە مەدینە بۆ ناو مەککە بە پێیان برۆم ، زۆر لام ئاسانتر بوو لەوەی بچم بۆ لای ئیمامی مالك .
ئیمام فەرمووی : دەتوانی بیهێنی بۆ ئێرە !!!
والیەکە وتی : نەخێر !! لەوانەیە رێگەمان پێ بدات چاومان پێ بکەوێ لە ماڵی خۆی ... بەهەر حاڵ با بچین بۆ ماڵی .

---

[2] والە : پارێزگار .

هەردووكیان چوون بۆ لای ئیمامی مالك ، كە گەیشتنە ماڵەكەی یەكێك لە پیاوانی والی لەدەرگای دا ، دوای كەمێك خزمەتكارێكی رەش پێست هاتە دەرەوە .
والی پێی وت : بەگەورەت بڵێ والی لەبەر دەرگای تۆیە !!!
خزمەتكارەكە چووە ژوورەوە ، دوای كەمێك هاتە دەرەوە و وتی : گەورەم دەڵێ : ئەگەر پرسیارت هەیە بینووسە تا وەڵامت بدەمەوە ، ئەگەر بۆ گوێ گرتنی فەرموودە هاتی ، بەخۆت دەزانی كەی فەرموودە دەگێڕمەوە !!!!
والی وتی : بڕۆ پێی بڵێ : نامەیكت بۆ هاتووە لە والی شاری مەككە .
لەم كاتە خزمەتكارەكە چووە ژوورەوە و كورسییەكی هێنا دەرەوە و داینا ، دوای كەمێك ئیمامی مالك هاتە دەرەوە ، پیاوێكی درێژی خاوەن هەیبەت و سامێكی زۆر بوو ، هەر كە دانیشت والی شاری مەدینە نامەكەی دا دەستی ، كە ئیمامی مالك نامەكەی خوێندەوە گەڕاندیەوە دەستی والی و وتی : سبحان الله !!! وای لێ هاتووە زانستی پێغەمبەری خوا ﷺ بە (واسطة) وەربگیرێ !!!
كە والی ئەمەی بیست ، جورئەتی نەكرد وەڵامی بداتەوە !!! لەم كاتە ئیمامی شافعی هاتە پێشەوە و فەرمووی : خوای گەورە چاكت بكا ، من كابرایەكم لە تیرەی عەبد مەنافم و ئاوا و ئاوام بەسەر هاتووە ......
كە ئیمامی مالك گوێی لەمە بوو ، قسەكانی ئیمامی شافعی زۆر پێ خۆش بوو ، لێی پرسی : ناوت چیە ؟
ئیمام فەرمووی : موحەممەد .
ئیمامی مالك فەرمووی : ئەی موحەممەد : لە خوای گەورە بترسێ و خۆت لە گوناه بپارێزە ، چونكە تۆ دەبی بە خاوەن پلە و پایەیەكی بەرز ، منیش ئەبینم خوای گەورە نوورێكی لەدڵ داناوی ، نەكەی بە گوناهەكان بیكوژێنیەوە !!
ئیمامی شافعی وتی : گوێ بیست و گوێڕایەڵم .
ئیمامی مالك فەرمووی : بەیانی وەرە لام تاكو موەتتەئەكەم بخوێنی .

بۆ بەیانی ئیمامی شافعی چووە خزمەت ئیمامی مالیك ، ئیمامی مالیك ویستی موەتتەئەکەی بخوێنێ بەڵام ئیمامی شافعی پێی وت : من ئەم کتێبەم لەبەرە !!
ئیمامی مالیك فەرمووی : بۆم بخوێنەوە !!
ئیمامی شافعی دەستی کرد بە خوێندنەوەی موەتتەئەکەی ئیمام ، ناوە ناوە ئەوەستا نەوەك ئیمامی مالیك بێزار بووبێ ، بەڵام ئیمام دەیفەرموو : بخوێنە ... بەڕاستی خوێندنەوەکەت زۆر خۆشە !!!
بەم جۆرە ئیمامی شافعی بوو بە قوتابی پێشەوای مەدینە .
ئیمامی شافعی فەرموویەتی : ئیمامی مالیك مامۆستا و فێرکەری منە ، ئەوم کردە بەڵگە لەنێوان من و خوای گەورە .
دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر لە لای ئیمامی مالیك ماوە ، ئیزنی لێ خواست بچێت بۆ شاری بەغدا ، ئیمامیش ڕێی پێدا و وڵاغێکی بۆ کڕی تا سەفەرەکەی ئەنجام بدات .
کە ئیمام گەیشتە شاری بەغدا زۆر گفتوگۆی لەگەڵ زانایانی عێراق کرد بە تایبەتی لەگەڵ ئیمامی موحەممەدی کوڕی حەسەنی شەیبانی قوتابی ئیمامی ئەبو حەنیفە ، کە موحەممەد زانی ئیمام زۆر شارەزایە ، بردیەوە ماڵی خۆی و ڕێی پێدا کتێبەکانی بۆ خۆی بنووسێ .
دوای ماوەیەکی زۆر مانەوە لەم شارە پڕ عیلم و زانستە ئیمامی شافعی بڕیاری دا بگەڕێتەوە شاری مەدینەی پیرۆز ، کە گەڕاوە ئەم شارە ، بینی ئیمامی مالیك لە مزگەوت دانیشتووە لە نێو قوتابیەکانی ، کە ئیمامی مالیك قوتابیە زیرەکەکەی خۆی بینی ، لە جێگای خۆی هەڵساوە و لەباوەشی خۆی نا !!
ئەمجارە ئیمام لەلای مامۆستاکەی ماوە تا ئیمامی مالیك وەفاتی کرد لە ساڵی ١٧٩ی کۆچی .

ئیمام فەرموویەتی : من پەرِی کتێبم زۆر بەهێمنی هەڵئەداوە کاتێك لە خزمەت ئیمامی مالك دەبووم لەبەر هەیبەت و گەورەیی مامۆستاکەم !!!
دوای ئەمە ئیمامی شافعی جارێکی تر چووە شاری بەغدا لە ساڵی ١٩٨ی کۆچی ، ئینجا دوای ساڵێك چووە میسر و هەر لەوێ مایەوە تا وەفاتی کرد .

# ئایا هیچ فەرموودە هاتووە دەربارەی ئیمامی شافعی ؟

ئیمامی ئیبن حەجەری عەسقەلانی فەرموویەتی : دوو فەرموودە هاتووە دەربارەی ئیمامی شافعی :
١ـ حەزرەتی ئیبن مەسعود خوا لێی رازی بێ فەرموویەتی : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( لاَ تَسُبُّوا قُرَيشَاً ، فَإِنَّ عَالِمَهَا يَمْلأُ الأَرْضَ عِلْمَاً )[3] .
ئەم فەرموودەیە ئیمامی ئەبو داوودی تەیالیسی لە موسنەدەکەی خۆی و ئیمامی ئەبو نوعەیم لە حیلیەکەی و ئیمامی بەیهەقی تەخریجیان کردووە ، لە ئیسنادەکەی ئەلنەزری کوڕی مەعبەد هەیە ، ئیمامی ئیبن حیبان بە باوەڕپێکراوی داناوە ، ئیمامی ئەبو حاتەم فەرموویەتی : فەرموودەکانی دەنووسرێن ، ئیمامی نەسائیش بە بێ‌هێزی داناوە .
ئەم فەرموودەیە لە ریوایەتی حەزرەتی ئەبو هورەیرەش هاتووە بە ئیسنادێکی بێ‌هێز ، لە ریوایەتی ئیمامی عەلیش هاتووە کە ئیمامی ئابوری تەخریجی کردووە ، لە ریوایەتی حەزرەتی ئیبن عەبباسیش هاتووە کە ئیمامی ئەبو نوعەیم تەخریجی کردووە

---

[3] واتە قسەی ناشرین بە قورەیش مەڵێن ، چونکە زانایەکی وایان لێ پەیدا دەبێ زانستەکەی هەموو زەوی دەگرێتەوە .

به ئیسنادێك پیاوەكانی هەموو پیاوی فەرموودەی صەحیحن تەنیا ئیسماعیلی كوڕی موسلیم نەبێ كە هەندێ قسەی دەربارەی كراوە .
ئیمامی بەیهەقی فەرموویەتی : ئەگەر ڕێگاكانی ئەم فەرموودەیە پێچنە پاڵ یەك بەهێز دەبێ و دەزانرێ ئەسڵی هەیە .
٢- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( إنَّ اللهَ يَبْعَثُ لِهَذه الأُمَّةِ عَلَى رأسِ كُلِّ مائةِ سَنَةٍ مَنْ يُجَدِّدُ لَهَا دِيْنَهَا )[4] .
ئەم فەرموودەیە ئیمامی ئەبو داوود وئەلحەسەنی كوڕی سوفیان لە موسنەدەكەی خۆی و ئیمامی حاكم و ئیبن عەدی لە پێشەكی كامیلەكەی خۆی تەخریجیان كردووە .
ئەم فەرموودەیە بەهێزە ، ئیمامی ئەحمەد فەرموویەتی : لەسەدەی یەكەم خەلیفە عومەری كوڕی عەبدولعەزیز بوو ، لەسەدەی دووەمیش ئیمامی شافعی بوو .
موحەممەدی كوڕی عەلی فەرموویەتی : گوێم لە زاناكانی خۆمان بوو دەیانفەرموو لەسەدەی یەكەم خەلیفە عومەری كوڕی عەبدولعەزیزی بوو ئایینی نوێ كردووە ، لەسەدەی دووەمیش ئیمامی شافعی بوو .

[4] واتە بێ گومان خوای گەورە لە سەرەتای هەر سەدەیەك زانایەكی وا بۆ ئوممەتم دەنێرێ ئایینەكەیان بۆ نوێ بكاتەوە .

# میحنەتی ئیمام

کە ئیمام ناوبانگی دەرکرد بە زانست و تەقوا لە یەمەن ، زۆر کەس ئیرەیی پێ برد و چەند بوختانێکیان پێ کرد بەوەی دژایەتی خەلیفە دەکات ، بۆیە خەلیفە هارونی رەشید فەرمانی دا ئیمام دەستگیر بکرێ .
دوای ماوەیەك ئیمام دەستگیر کرا و بردرا بۆ لای خەلیفە ، کە هاتە لای فەرمووی : السلام علیکم یا أمیر المؤمنین و برکاته ...
خەلیفە وتی : و علیك السلام و رحمة الله و برکاته ... سوننەت بەجێ دەگەیەنی کە سەلام کردنە ... بەلام واجیبێك جێدەهێڵی کە گوێڕایەڵی منە !!!
ئیمام فەرمووی : ئەی ئەمیری ئیمانداران : تۆ منت ئەمین کرد کاتێك وەلامی سەلامی منت داوە .
خەلیفە وتی : ئەی بۆچی دژمان دەوەستی ؟!!
ئیمام فەرمووی : من قسەم پێ ناکرێ لەگەڵ ئەو هەموو کۆت و زنجیرەی کە منیان پێ بەستوە ، ئەگەر فەرمان بدەی لەسەرم لایبەن زۆر چاکە .
خەلیفەش فەرمانی دا کۆتەکەی بکەنەوە ، ئیمام فەرمووی : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا ﴾ ، من ئەو کەسە نیم دژایەتی خەلیفەی موسڵمانان بکەم ، ئەمە بوختانێکە پێم کراوە ، تۆ خەلیفەی موسڵمانانی وئامۆزای پێغەمبەری خوای ﷺ .
خەلیفە کە ئەم قسانەی بیست زۆر دڵی خۆش بوو و وتی : خەم مەخۆ و مەترسە !! زانستەکەت چۆنە دەربارەی کتێبی خوای گەورە ؟
ئیمام فەرمووی : لە کامە کتێب پرسیارم لێ دەکەی ؟ خوای گەورە زۆر کتێبی هێناوەتە خوارەوە ؟!

خەلیفە وتی : ئافەرین !! من پرسیارت لێ دەکەم دەربارەی قورئانی پیرۆز کە بۆ ئامۆزام هاتۆتە خوارەوە[5] .

ئیمام فەرمووی : زانستەکانی قورئان زۆرن لە کامەیان دەپرسی ؟

ئینجا زانستەکانی قورئانی یەك یەکی بۆ شی کردەوە ، خەلیفەش سەرسام بوو بەم زانستەی ئیمام هەیەتی .

دوای ئەمە خەلیفە جۆرەها پرسیاری ئاراستەی ئیمام کرد ، ئەویش وەڵامی تێروتەسەلی دەداوە .

لەدوایی خەلیفە وتی : ئامۆژگاریم بکە ئەی شافعی ؟

ئیمام ئامۆژگاریەکی ئاوای خەلیفە کرد کە وای لێ بکات بگری !!

هارونی رەشید ویستی پاداشتی بداتەوە ، بەلام ئیمام فەرمووی : نەخێر ئەمیری ئیمانداران : من کرێ لەسەر ئامۆژگاریم وەرناگرم !!

پاشان روخسەتی لە خەلیفە خواست بڕوا ، هارونیش رێی پێ بدا .

---

[5] مەبەستی پێغەمبەری خوایە ﷺ ، چونکە هارونی رەشید لە نەوەی ئیمامی عەبباسی مامی پێغەمبەرە ﷺ .

# ماموٚستاکانی ئیمام

ئیمامی شافعی زۆر ماموٚستای هەبوو ، ئەمانە ناوی هەندێکیانن :

- ئیسماعیلی کوڕی قوستەنتین : ئیمام قورئانی پیرۆزی لە لا خوێند .
- ئیمامی سوفیانی کوڕی عویەینە .
- ئیمامی موسلیمی کوڕی خالیدی زەنجی .
- ئیمامی مالك .
- ئیبراهیمی کوڕی سەعیدی ئەنصاری .
- عەبدوڵڵای کوڕی نافع .
- هیشامی کوڕی یوسف .
- وەکیعی کوڕی جەڕاح .
- ئیسماعیلی کوڕی عولەییە .
- موحەممەدی کوڕی عەلی .
- سولەیمانی کوڕی عەمر .
- ئەیوبی رەمەلی .
- عەبادی کوڕی عەوام .
- وەلی خوای گەورە فوزەیلی کوڕی عیاز .
- یەحیای کور سەعیدی قەتتانی قەمرووەدناس .
- یوسفی کوڕی ئەسوەد .

چەندین ماموٚستای تر .

# قوتابیەکانی ئیمام

زۆر قوتابی لە ژێر دەستی ئیمامی شافعی بوون بە زانای گەورە ، لەوانە :

- ئیمامی ئەحمەد : کە یەکێکە لەسەر مەزهەبەکان .
- ئیمامی حومەیدی : کە مامۆستای ئیمامی بوخاریە .
- ئیمامی ئەبو عوبەید : کە ئیمامێکی گەورەی زمانی عەرەبیە .
- ئیمامی بوەیتی .
- ئیمامی ئەبو سەور .
- ئیمامی رەبیعی موورادی .
- ئیمامی زەعفەرانی .
- ئیمامی موزەنی .
- ئیمامی حەرمەلەی کوڕی یەحیا .
- ئیمامی کەرابیسی .
- ئیمامی رەبیعی جیزی .
- ئیبن عەبدولحەکەم .
- ئیمامی ئەصمەعی : کە یەکێکە لە ئیمامەکانی زمانی عەرەبی .
- ئەحمەدی کوڕی حەججاجی مەروەزی : کە مامۆستای ئیمامی بوخاریە .
- ئیسماعیلی رازی .
- ئەلحاریسی کوڕی سەریجی قەففال .
- خالیدی کوڕی ئیزاری ئەیلی .
- سوفیانی کوڕی سەعیدی حەبباب .
- ئەبو ئەیوبی بەغدادی .

- ئیمامی ئەبو حاتەمی سیجەستانی فەرموودناس .
- عەبدولڕەحمانی کوڕی مەهدی فەرموودەناس .
- ئیمامی ئیبن هیشام خاوەنی سیرە بەناوبانگەکە .
- قوتەیبەی کوڕی سەعیدی بەلەخی .
- نەصری مەککی .
- ئەبو شەبیبی میسری .

# ژن هێنانی

لەدوای وەفات کردنی ئیمامی مالك ، ئیمامی شافعی حەمیدەی کچی نافعی نەوەی ئیمامی عوسمانی کوڕی عەففانی کرد بە هاوسەری و خوای گەورە چوار منالی پێ بەخشین :

١ـ موحەممەد ئەبو عوسمان : بوو بە قازی جەزیرە و لەگەڵ ئیمامی ئەحمەد کۆبۆوە ، لەساڵی ٢٤٢ی کۆچی وەفاتی کرد .

٢ـ موحەممەد : بە بچووکی مرد .

٣ـ فاتیمە .

٤ـ زەینەب .

# شێوەی ئیمامی شافعی

ئیمام مرۆڤێکی درێژی لاوازی شان بچووك بوو ، روومەتی پڕ و رەنگی ئەسمەر بوو ، چەند خاڵێك لەسەر لووتی هەبوو و ، برۆیەکانی تێکەڵاو بوون ، ردێنەکەشی پێنج پەنجە درێژ بوو ، بەردەوام جل وبەرگی خاوێن و بەنرخی ئەکردەبەر و بەردەوام خوفقی لەپێ بوو ، هەروەها هەموو رۆژێك سەردانی هەژارانی دەکرد .

خاوەن زمانێکی پاراو و دەنگێکی گەورە و خۆش بوو ، ئیمامی ئەحمەد فەرموویەتی : ئەگەر قسەی بکردایە دەنگەکەی وەکو زەنگ وابوو لە خۆشی .

لەسەر ئەنگوستیلەکەی نوسراو بوو ( كفى بالله ثقة لمحمد بن إدريس ) ، واتە : خوای گەورە بەسە پشت و پەنای موحەممەدی کوڕی ئیدرسی بێ .

# زیرەکی ئیمام

- ئیمامی شافعی فەرموویەتی : کاتێك کتێبم دەخوێندەوە دەستی خۆم لەسەر لاپەڕەکەی تر دائەنا تاوەکو ئەوەی ترم ئەخوێندەوە لە ترسی ئەوەی هەردووکیان بەیەکەوە لەبەر بکەم !!
- ئیمام لە هەموو زانستێك زیرەك بوو بە جۆرێك کە لە دوای ئەنجام دانی نوێژی بەیانی قوتابیەکانی وانەی قورئان ئەهاتن بۆ خوێندن تا خۆرهەڵاتن ، ئینجا قوتابیەکانی فەرموودە ئەهاتن بۆ گوێ گرتن لە فەرموودەکان ، دوای ئەوان قوتابیەکانی نەحو و زمانی عەرەبی ئەهاتن و تاکو نیوەڕۆ دەیانخوێند .
- رۆژێکیان ئیمام لە ناو قوتابیەکانی دانیشتبوو ، پیاوێك هاتە خزمەتی و وتی :

سَلِ العالِمَ المَكّيَّ هَلْ فِي تَزاوُرٍ

وَ ضَمِّ لِمُشْتَاقِ الفُؤادِ جُناحُ[6]

ئیمام وەڵامی داوە و فەرمووی :

مَعَاذَ اللهِ انْ يُذْهِبَ التُّقَى

تَلاَصُقُ اَكْبَادٍ بِهِنَّ جِرَاحُ[7]

قوتابیەکانی ئیمام هیچ لەم قسانە نەگەیشتن و لێیان پرسی ئەم کابرایە چی وت ؟ ئیمام فەرمووی : ئەو پیاوە پرسیاری لەوە دەکرد ئایا ماچ کردنی ژنی خۆی لە مانگی رەمەزان رۆژوو بەتاڵ دەکات یان نا ؟

منیش وتم : نەخێر .

قوتابیەکان یەکێکیان ناردە دوای پیاوەکە تا لێی بپرسێ لە مەبەستەکەی لەو دێرە شیعرە ، ئەویش وتی : مەبەستم ماچ کردنی ژن بوو ئایا رۆژوو بەتاڵ دەکا یان نا ؟

قوتابیەکان زۆر سەرسام بوون بەزیرەکی و تێگەیشتنی مامۆستایان .

- ئیمام فەرموویەتی : قورئانی پیرۆزم خوێندەوە و هەموو تێگەیشتم و زانیم مانای چیە تەنیا دوو وشە نەبێ نەمزانی مانایان چیە : یەکێکیان ئەم ئایەتەیە : ﴿ وَ قَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا ﴾ .
- ئیمامی حومەیدی فەرموویەتی : هەندێ جار ئیمامی شافعی پرسیاری وا قورس و گرانی لێ دەکردین و دەیفەرموو : هەر کەسێ وەڵامی داوە دینارێکی پێ دەبەخشم !!

پرسیارەکە ئەوەندە قورڵ بوو نەماندەزانی وەڵامەکەی چیە ؟!!

---

[6] واتە : پرسیار لە زانای خەڵکی شاری مەککە بکە : ئایا سەردانی خۆشەویست ولەباوەشنانی حەرامە ؟

[7] واتە : پەنا بەخوا پێکەوەنووسانی دوو جەرگی بریندار تەقوای مرۆڤ نەهێڵێ و کەمی بکاتەوە .!!

# کتێبەکانی ئیمام

مامۆستا عەبدولڕەحمانی دوجەیلی دەڵێ : ئیمامی شافعی زیاتر لـە ١٥٠ کتێبی داناوە .

ئەمانەش ناوی هەندێ لە کتێبەکانیەتی :

١ـ الأم .

٢ـ الرسالة .

٣ـ اختلاف الحديث .

٤ـ الإملاء الصغير .

٥ـ الأمالي الكبرى .

٦ـ مختصر الربيع .

٧ـ مختصر المزني .

٨ـ مختصر البويطي .

٩ـ كتاب الجزية .

١٠ـ مجمع الكالي .

١١ـ عيون المسائل .

١٢ـ البحر المحيط .

١٣ـ الجامع الكبير .

١٤ـ الإختصار .

١٥ـ المسند .

١٦ـ السنن .

١٧ـ الحجة .

١٨ـ الفقه الأكبر .

١٩ـ احكام القرآن .

٢٠ـ كتاب الجزية .

٢١ـ كتاب علي و عبدالله .

٢٢ـ إبطال الإستحسان .

٢٣ـ بيان الفرض .

٢٤ـ اختلاف العراقيين .

٢٥ـ جماع العلم .

٢٦ـ صفة الأمر و النهي .

٢٧ـ فضائل قريش .

٢٨ـ أدب اقاضي .

٢٩ـ المنثورات .

٣٠ـ التلقيح في علم القيافة .

٣١ـ التمهيد في أصول التوحيد .

٣٢ـ كتاب السبق و االرمي .

٣٣ـ تعظيم قدر الصلاة .

٣٤ـ كتاب إثبات النبوة .

٣٥ـ الكتاب الجديد .

٣٦ـ منافع القرآن .

٣٧ـ ديوانى شيعرەكەى[٨] .

---

[8] ئەم كتێبانە ئیمامی نەوەوی لە ( المجموع ) و مامۆستا ئیسماعیل یوسف لە پێشەکی دیوانی ئیمامی شافعی و ئیبن هیدایەتوللا لە ( طبقات الشافعية ) و مامۆستا عادل نوەیهز لە لێکۆڵینەوەکەی بەسەرداو و حاجی خەلیفە لە .

# زنجیرەی زانستی ئیمامی شافعی

ئیمامی شافعی لەلای ئیمامی موسلیمی کوڕی خالیدی زەنجی خوێندووە ، ئەویش لە لای عیکریمە و موجاهیدی خوێندووە ، ئەوانیش لەلای حەزرەتی ئیبن عەبباسیان خوێندووە خوا لێی رازی بێ ئەویش صەحابەیکی بەرزی پێغەمبەرە ﷺ .

# ئەحوال و کەڕاماتی ئیمامی

* جارێکیان ئیمامی شافعی پێغەمبەری بینی ﷺ لەخەودا ، پێغەمبەر ﷺ لێی پرسی : تۆ کوڕی‌کێی ؟

ئیمام وتی : من لە نەوەی تۆمە ئەی پێغەمبەری خوا .

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : لێم نزیك بەوە .

ئیمامی شافعی لە جەنابی نزیك بۆوە و پێغەمبەر ﷺ هەندێ لە تفی پیرۆزی بەسەر زمان و لێوی ئیمامی شافعی داهێنا و پێی فەرموو : بڕۆ خوای گەورە پیرۆزت بکات .

- کاتێك ئیمام لە مەککە بوو و هێشتا منداڵ بوو ، ئەوەندە قورئانی بە دەنگێکی خۆش ئەخوێندەوە زانایانی شاری مەککە ئەیانفەرموو : با بچینە لای ئەم منداڵە قورئانمان بۆ بخوێنێ تاکو کەمێك بگرین !!

---

( کشف الظنون ) ئیمامی ئیبن حەجەر لە ( توالي التأسيس) و ئەبولفیدائی قازی لە لێکۆڵینەوەکەی بەسەریدا باسیان کردوون .

که دەهاتنە لای و قورئانی بۆ دەخوێندن ، هەموویان دەستیان بە گریان دەکرد و لە هۆش خۆیان دەچوون !

- ئیمام لە شەو و رۆژێکدا خەتمێکی قورئانی دەخوێند ، بەلام لە مانگی رەمەزان ٦٠ جار خەتمی دەکرد .
- ئیمام شەوانی کرد بوو بە سێ بەش :

لە بەشی یەکەم کتێبی دائەنا .

لە بەشی دووەم شەونوێژی دەکرد .

لە بەشی سێیەم ئەخەوت !!

- ئیمامی شافعی بە رەبیعی موورادی فەرموو : لەدوای من ، تۆ کتێبەکانم ریوایەت دەکەی و بەخەلك رادەگەیەنی .

ئەم قسەیەی ئیمام وەکو خۆی دەرچوو ، رەبیعی موورادی دوای وەفات کرنی ئیمام نزیکەی ٦٦ سالّ کتێبەکانی ئیمامی دەگێڕاوە و خەلك ئەینووسیەوە ، تاوەکو وای لیّ هات پێش دەرگای پڕ دەبوو لە خەلك بۆ گوێ گرتن لە کتێبەکانی ئیمام .

- جارێکیان ئیمام پرسیاری لیّ کرا دەربارەی فەرموودەیەك ، ئەویش وەلامی داوە ، یەکێك لە دانیشتوان وتی : ئەی تۆ چی دەڵێی ؟!

لەم کاتە ئیمام دەستی بەلەرزین کرد و فەرمووی : چ ئاسمانێك لە ژێر خۆی دامدەنێ و چ زەویەك لەسەر خۆی رام دەگرێ ئەگەر من فەرموودەیەك بگێڕمەوە و بە پێچەوانەی هەلس وکەوت بکەم .

- ئیمامی مزەنی فەرموویەتی : هیچ کەسێ وەکو ئیمامی شافعی نەبوو لە بەخشیندا ، جارێکیان خزمەتکارێك هاتە لای و پێی وت : گەورەم ئەو پارەیەی بە دیاری بۆ جەنابت ناردووە .

پارەکەش لەناو کیسەیەك بوو ، ئیمام پارەکەی وەرگرت و لەناو شوێنێکی جل وبەرگی خۆی دانا ، ماوەیەکی کەم پێچوو پیاوێك هاتە خزمەتی و فەرمووی : قوربان : هەر ئێستا ژنەکەم منالّی بووە و هیچم نیە بۆی سەرف بکەم .
ئیمامیش یەکسەر ئەو پارەیەی ناو کیسەکەی پێ بەخشی و هیچی بۆ خۆی نەگێڕاوە !!

- ئیمامی شافعی بە بوەیتی فەرموو : تۆ لەناو کۆت و زنجیری ئاسن دەمری !! لەدوای وەفات کردنی ئیمام ئەم قسەیەی هاتە جێ ، ئەوەبوو ئیمامی بوەیتیان دەستگیر کرد و بەندیان کرد تاوەکو لەناو کۆت و زنجیرەکەی وەفاتی کرد رەحمەتی خوای لێ بێ .
- جارێکیان ئیمامی شافعی لەگەلّ موحەممەدی کوڕی حەسەنی مامۆستای تەماشای پیاوێکیان کرد ، موحەممەد وتی : ئەزانی ئەم پیاوە چ کارە ؟

ئیمام فەرمووی : یان دارتاشە یان بەرگدرووە .
لەم کاتە یەکێك گوێی لەو گفتوگۆیەی نێوان ئیمام و مامۆستاکەی بوو ، بەپەلە چووە لای پیاوەکە و لێی پرسی : جەنابت چ کارەی ؟
پیاوەکە وتی : پێشتر دارتاش بووم ، بەلاّم ئێستا بەرگدرووم !!!

- ئیمام فەرموویەتی : لەو کاتەی منالّ بووم ، خەونم بە پیاوێك بینی پێش نوێژی بۆ خەلّك دەکا ، منیش لێی نزیك بوومەوە و پێم وت : فێرم کە !!

پیاوەکە تەرازوێکی لەناو گیرفانی دەرهێنا و دایە دەستم و پێی وتم : ئەمە بۆ تۆیە !!
ئەم خەونەم بۆ یەکێك لەزاناکان گێڕاوە ، کە گوێی لێ بوو فەرمووی : تۆ گەورە دەبی و لەسەر رێ و سونەتی پێغەمبەر ﷺ دەڕۆی .

- هەروەها فەرموویەتی : لەخەونمدا بینیم مرۆڤێك هاتە لام و کتێبەکانی منی لە هەوا پەرت و بلاّو کردەوە .

که ئەم خەونەم بۆ زانایەك گێڕاوە فەرمووی : ئەگەر ئەم خەونەت ڕاست بێ ئەوا هیچ شارێك لە شارەكانی ئیسلام نامێنێ زانستی تۆی لێ نەبێ !!

- ئیمامی ئەبو سەور فەرموویەتی : كە ناوبانگی ئیمامی شافعیم بیست ، چووم بۆ لای و پرسیارێكم لێكرد بەڵام مەبەستم گاڵتە كردن بوو ، بەڵام ئیمام وەڵامی نەدامەوە ، دوای ماوەیەك كە گەورەیی ئیمام لەدڵم جەسپا و بووم بە یەكێ لە قوتابیانی ، پێی فەرمووم : وەڵامی پرسیارەكەت ئاواو ئاوایە ، بەڵام ئەو كاتە وەڵامم نەدایەوە چونكە دەمزانی مەبەستت گاڵتە كردن بوو !!!
- جارێكیان پیاوێك كە خەڵكی صەنعا بوو هاتە خزمەت ئیمام ، هەر كە ئیمام چاوی پێكەوت فەرمووی : تۆ خەڵكی صەنعای ؟

پیاوەكە وتی : بەڵێ .

ئیمام فەرمووی : ئەی كارت ئاسنگەریە ؟

وتی : بەڵێ !!

- ئیمامی ڕەبیعی كوڕی سولەیمان فەرموویەتی : ئیمامی شافعیم لە خەوندا بینی و لێم پرسی : چیت بەسەر هات دوای مردنت ؟

فەرمووی : خوای گەورە منی لەسەر كورسییەكی زێڕ دانا و دوڕ ومەرجانی بەسەردا باراندم !

- پیاوێك هاتە خزمەت ئیمامی مالك و پێی وت : من بولبولێكم بەو كابرایە فرۆشتووە و پێم وتوە : ئەمە هەرگیز بێ دەنگ نابێ و هەر دەنگی خۆشی لێوە دێ ، تەڵاقم كەوێ ئەگەر وانەبێ !!

دوای ڕۆژێك بولبولەكەی بۆ هێنامەوە و وتی : ئەمە دەم نادەم بێ دەنگ دەبێ ... ئایا تەڵاقم كەوتووە ؟!!

ئیمامی مالك فەرمووی : بەڵێ !!

ئیمـامی شـافعی کـه ئامـاده بـوو فـه‌رمووی : قوربـان : لـه‌لای مـن تـه‌لاقی نه‌که‌وتووه !!!

ئیمامی مالك فه‌رمووی : چۆن ؟ به‌ڵگه‌ت چیه ؟

ئیمـام فـه‌رمووی : له‌بـه‌ر فـه‌رمووده‌ی فاتیمـه‌ی کـچی قـه‌یس کـه دوو کـه‌س خوازبێنیان کرد که یه‌کێکیان حه‌زره‌تی ئه‌بو جه‌هم بوو ، پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌رباره‌ی ئه‌بو جه‌هم فه‌رمووی : ( لاَ يَضَعُ عَصَاهُ عَنْ عَاتِقِهِ ) ، واته : ئه‌بو جه‌هم هـه‌رگیز داری سه‌فه‌ر لـه‌سـه‌ر شانی ناهێنێتـه خـواره‌وه ، واتـه : بـه‌ردوام لـه‌سـه‌فه‌ردایه ، زانراویشه حـه‌زره‌تی ئـه‌بو جـه‌هم ده‌خـه‌وت و ده‌مـاوه و داده‌نیـشت ، که‌واتـه مه‌به‌ستی ئه‌م پیاوه ئه‌وه بوو که زۆربه‌ی کاته‌کان ده‌خوێنێ و ده‌نگی خۆشی لێوه دێ ، وانیه ؟

پیاوه‌که وتی : به‌ڵێ من مه‌به‌ستم وابوو !!

ئیمامی مالك فه‌رمووی : راست ده‌که‌ی ... ته‌لاقی نه‌که‌وتووه !!!

- ئیمام فه‌رموویه‌تی : ئیمامی عه‌لیم له‌خه‌ونداا بینی ، ئیمام هاته لام و سـه‌لامی لێ کردم و ته‌وقـه‌ی لـه‌گـه‌ڵ کـردم و ئه‌نگوسـتیله‌که‌ی خـۆی لـه په‌نجـه‌ی پیرۆزی هێنا ده‌ره‌وه و لـه په‌نجه‌ی منی دانا .

که به‌یانی هات و له‌خه‌و هه‌ڵسامه‌وه ، چوومه لای مـامم کـه لـه‌خـه‌ون شـاره‌زا بوو، که خه‌ونه‌کم بۆ گێڕاوه وتی : ته‌وقه کردنی له‌گه‌ڵت دوورکه‌وتنه‌وه‌یـه لـه سزا و ، دانانی ئه‌نگوستیله‌که‌ی له په‌نجه‌ت مانای ئه‌وه‌یه که ناوی تۆ وه‌کو ناوی ئیمامی عه‌لی له هه‌موو شوێنێك بلاَوده‌بێته‌وه !

یونسی کوڕی عەبدولئەعلا فەرموویەتی : هیچ کەسێکم نەبینوە ئارامی هەبێ لەسەر نەخۆشی وەکو ئیمامی شافعی ، کاتێك دادەنیشت بۆ فێرکردنی زانست شتێکیان لەژێر دادەنا تا خوێنەکەی بکەوێتە ناوەوە[9] !!!

- کاتێك ئیمام ناوبانگی دەرکرد بە زانست و تەقوا لە میسر ، هەندێ حەسوود چوونە لای والی میسر و وایان لێ کرد ئیمام لە میسر نەهێلێ ، لەبەر ئەوە بەدوای ئیمامی نارد و پێی وت : نابێ لەمڕۆ زیاتر لەم وڵاتە بمێنی .

ئیمام فەرمووی : بۆچی ؟

وتی : چونکە تۆ هۆی پەیدا بوونی ئاژاوەی منیش ناهێڵم ئەم شتە من روویدا !!

ئیمام فەرمووی : دەتوانی سێ رۆژ مۆڵەتم پێ بدەی تا خۆم ئامادە بکەم .

وتی : باشە ، وا سێ رۆژ مۆڵەتم پێدای تا خۆت ئامادە بکەی .

بەڵام رۆژی سێیەم دانەهات تا والی لەناو دارەبازەیەك دانرا بوو و خەڵك بۆ گۆڕستان دەیانبرد تا بینێژن !!!

- ئیمامی رەبیعی مورادی فەرموویەتی : ئەلمەئمون بەدوای ئیمامی نارد تا بێت بە قازی ، کە نێرداوەکە هاتە خزمەت ئیمام و ئەمەی پێ وت ، ئیمام فەرمووی : خوایە : ئەگەر ئەم شتە خێری تیایە بۆ ئایین و دونیام ئەوا بۆم ئاسان بکە و ، ئەگەر نا ئەم رووحە بۆ خۆت ببەوە .

رۆژی سێیەم دانەهات ئیمام وەفاتی کرد رەحمەتی خوای لێ بێ .

---

[9] ئەمە لە کۆتایی ژیانی ئیمام بوو کاتێك نەخۆشیەکەی زۆر توند بوو رەحمەتی خوای لێ بێ .

# فەرموودەی زانایان دەربارەی ئیمامی شافعی

- ئیمامی ئیسحاقی کوڕی راهەویْ فەرموویەتی : ئیمامی ئەحمەد پێی فەرمووم : وەرە پیاوێکت نیشان بدەم تاوەکو ئێستا یەکێکی وەکو ئەوت نەبینیوە .

ئینجا منی بردە لای ئیمامی شافعی .

- ئیمامی ئەحمەد فەرموویەتی : هەر کەسێ دەست بکاتە پێنووس و شتێك بنووسێ لە ئایینی خوای گەورە ، ئیمامی شافعی فەزلێکی بەسەردا هەیە !!
- ئیمامی ئەبوو داوود فەرموویەتی : نەمزانیوە ئیمامی شافعی فەرموودەیەکی بەهەڵەی گێڕابێتەوە !
- ئیمامی زەهەبی فەرموویەتی : ئیمامی شافعی فەرموودەناس و شارەزایی لە بەهێزی و بێ هێزی فەرموودەکان هەبوو ، هیچ فەرموودەیەکی وەرنەدەگرت مەگەر تەواو نەبووایە .
- ئیمامی نەوەوی فەرموویەتی : بزانە : ئیمامی شافعی بەشی لە هەموو کردەوە باشەکان هەبوو لەگەڵ رەوشت بەرزی و زانستی زۆر ...
- ئیمامی حومەیدی فەرموویەتی : ئیمامی شافعی بەیەك مانگ ٦٠ جار قورئانی خەتم دەکرد !
- ئیمامی ئیبنولعیماد فەرموویەتی : ئیمامی شافعی لە هەموو کەسێك زیاتر شارەزایی لە ئەدەب و (فقه) و خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز هەبوو .
- ئیمامی ئیبن حەجەر فەرموویەتی : ئیمامی شافعی بنچینەی فیقهی ئیسلامی داناوە و هەموو کەسێك دانی ناوە بە زانست و شارەزاییەکەی .
- ئیمامی داوودی زاهیری فەرموویەتی : ئیمامی شافعی سیفەتی وای لێ کۆبۆتەوە لە کەم کەس بەدی دەکرێ : لە بنەماڵەیەکی گەورە

هەڵکەوتووەو ، شارەزاییەکی تەواوی هەبوو لە فەرموودە و ئەیزانی کامەی بەهێزە و کامەی پێ هێزە و کامەی ناسیخە و کامەی مەنسووخە و ، شارەزایی هەبوو لە قورئان و سوننەت و مێژووی خەلیفەکانی ئیسلام و ، شێوازێکی زۆر جوانی هەبوو لە نووسین .

- ئیمامی مالك فەرموویەتی : تاوەکو ئێستا قورەیشییەکم نەدیوە وەکو شافعی زیرەك بێ !
- ئیمامی ئەبو نوعەیم فەرموویەتی : ئیمامی شافعی ئیمامێکی کامڵ و زانایەکی گەورە و خاوەن کردەوەی چاك و روشتی پاك بوو .
- ئیمامی حومەیدی فەرموویەتی : پیاوێکی ئاقڵترم نەدیوە لە ئیمامی شافعی !!
- ئیمامی ئیبن خوزەیمە فەرموویەتی : ئیمامی ئەحمەد تەنیا قوتابیەکی ئیمامی شافعی بوو !
- حەزرەتی جونەیدی بەغدادی فەرموویەتی : ئیمامی شافعی موریدێکی حەق بوو ، خوای گەورە حەقی لەسەر زمانی روون کردەوە !
- ئیمامی موسلیم فەرموویەتی : ئیمامی شافعی یەکێکە لە پیاوە تێگەیشتووەکان .
- ئیمامی تیرمزی فەرموویەتی : یەکێك لە زانایانی ئیسلام ئیمامی شافعیە .
- ئیمامی غەزالی فەرموویەتی : ئیمامی شافعی ئیمامێکی خواپەرستی دونیانەویستی زانای تێگەیشتوو بوو ، هەموو کردەوەکانی تەنیا بۆ خوای گەورە بوو .

## هەندێ لە فەرموودەکانی ئیمامی شافعی

ئیمام فەرموویەتی :

- حەزم لێیە ئەم خەڵکە زانستەکەم فێر بن بەبێ ئەوەی یەك پیت بۆ لای من بدرێ !
- گفتوگۆم لەگەڵ هیچ کەسێ نەکردووە مەگەر حەزم لێ نەبووبێ هەق و راستی لەسەر زمانی ئەو دەرکەوێ .
- گفتوگۆم لەگەڵ هیچ کەسێك نەکردووە بەمەبەستی بردنەوە بەسەریدا .
- داواکردنی زانست لە نوێژی سوننەت باشترە .
- هەر کەسێ دونیای بوێ با خۆی بگەیەنێتە زانست و ، هەر کەسێ قیامەتی دەوێ با زانست داوا بکات .
- لە ژیانم درۆم نەکردووە !!
- تاوەکو ئێستا نەبەڕاست نەبەدرۆ سوێندم بەخوا نەخواردووە .
- هەر کەسێك بەتەقوا خاوەن عیززەت نەبێ ، هەرگیز عیززەتی نابێ .
- هەر کەسێك شەهوەتەکەی بەسەریدا زاڵ بێ ، دەبێتە بەندەی ئەم شەهوەتە .
- هەر کەسێ قەناعەتی هەبێ ، زەلیل و ریسوا نابێ .
- باشترین زەخیرە لەخواترسانە .
- هەر کەسێ حەزی لێیە دڵی رووناك بێ با واز لە قسە بێنێ لە شتێك پەیوەندی بەو نیە و خۆی لە گوناهەکان بپارێزێ و کردەوەکانی کەس پێ نەزانێ جگە لە خوای گەورە .
- ئەگەر یەکێك قەدری قیامەت نەزانێ چۆن خۆی لە دونیا دەپارێزێ ؟
- عەقل سنوورێکی هەیە ناتوانێ لێی تێپەرێ ، هەروەکو چۆن بینین سنووری هەیە و ناتوانێ بیبەزێنێ .

- پیاوەتی چوار بنەمای هەیە : رەوشت پاکی ، بەخشین ، خۆ بەکەم زانین و ، سوپاس کردن .
- هەر کەسێ قورئان بخوێنێ لە چاوی خەڵك گەورە دەبێ .
- هەر کەسێك فەرموودە بنووسێ بەڵگەی بەهێز دەبێ .
- ئەو کەسەی قسەی خەڵك بۆ تۆ دەهێنێ ، قسەی تۆش بۆ خەڵك دەبات .
- ئەو کەسە ئاقڵە کە ئەقڵەکەی لە هەموو شتێکی ناشیرین دووری دەخاتەوە .
- هیچ خۆشیەك نیە بگاتە خۆشی شاد بوون بە هاورێ و دۆستان .
- داواکاری زانست پێویستی بە سێ خەسڵەت هەیە : دەست پاکی ، تەمەن درێژی و ، زیرەکی .
- ئەگەر بزانم خواردنەوەی ئاوی سارد لە پیاوەتیم کەم دەکاتەوە ، نایخۆمەوە !!
- زانست زانایان لەیەك نزیك دەکاتەوە هەروەکو چۆن خزم لەیەك نزیك دەکاتەوە .
- سێ کردەوە هەن زۆر بە گرانی ئەنجام دەدرێن : بەخشین لەکاتی دەست کورتی ، لەخواترسان لە کاتی تەنهایی و ، وتنی قسەی هەق لەلای ئەو کەسەی خەڵك لێی دەترسێ .
- ستەمکارترین کەس ئەو کەسەیە کە خۆی بەکەم نیشان دەدات بەرامبەر ئەو کەسەی رێزی ناگرێت .
- هەر کەسێ حەزی لێیە کۆتایی ژیانی خێر بێ ، با گومانی بە خەڵك باش بکات .
- ئەوەی نهێنی خۆی بپارێزێ ، ئیش و کاری لە ژێر دەستی خۆی دەبێ .
- بۆ هەر شارێك چووبم خۆم بە رێبوار داناوە ، تەنیا لە بەغدا نەبێ خۆم بە نیشتەجێ دانا .

# وەفات کردنی ئیمام

لە شەوی جومعەی بیست و نۆی رەجەبی ساڵی ٢٠٤ی کۆچی لە دوای نوێژی عیشا ، هەندێ لە قوتابیانی ئیمام هاتنە لای تاوەکو بزانن نەخۆشیەکەی سووك بووە یان نا ، پێیان وت : ئێستا حاڵت چۆنە ؟

فەرمووی : برایەکانم : وا لەدونیا دەردەچم و بەرێ دەکەوم و برایەکانم جێ دەهێڵم وپەرداغی مردن دەخۆمەوە و دەچمە لای کردەوە خراپەکانم ، نازانم روحەکم بۆ بەهەشت بەرێ دەکەوێ یان بۆ ئاگر رادەکێشرێت !!

ئینجا فەرمووی : ماڵ ئاوا برایەکانم ... ئێستا کاتی لەیەك جیابوونەوەیە ...

ئینجا رووی کردە قیبلە و فەرمووی : أشهد أن لا إله إلاّ الله و أشهد أن محمداً رسول الله ...

ئینجا رووحی پاکی دەرچوو بۆ لای رەحمەتی خوای گەورە ...

رەبیعی موڕادی فەرموویەتی : لەخەوغدا بینیم حەزرەتی ئادەم علیه السلام وەفاتی کردووە ، پرسیارم کرد لەمە ، پێیان وتم : ئەمە مانای ئەوەیە زاناترین کەس لەم دونیا دەمرێ ...

ئینجا ئیمامی شافعیان لە قەرافە ناشت لەدوای نوێژی عەسری رۆژی هەینی ، ئێستاش قەبرەکەی لە وڵاتی میسرە ...

کە وەفاتی کرد تەمەنی ٥٤ ساڵ بوو ...

هەزاران رەحمەتت لێ بێ ئیمامی بەڕێز ...

ئەی پێشەوای خاوەن تەقوا ...

ئەی ئەو زانایەی دونیات پڕکرد لە زانست و خواپەرستی ...

## ناوی ئیمام

ناوی : نوعمانی کوڕی سابیتی کوڕی زۆتای کوڕی ماهی تەیمی کوفیە خوا لێی ڕازی بێ .

## لە دایك بوونی

ئیمام لە شاری کوفە لە عیراق لە ساڵی ۸۰ی کۆچی لە دایك بووە و هەر لەو شارە گەورە بووە .

## داواکردنی زانست

ئیمام دەفەرمووێ : لە سەرەتای ژیانم کوتاڵم دەکڕی و دەفرۆشت ، تا ڕۆژێکیان بەلای ئیمامی شەعبیدا تێپەڕیم ، کە منی بینی پێی فەرمووم : ئەوە بۆ کوێ دەچی ؟
وتم : بۆ بازار .
فەرمووی : وا مەکە ! من زیرەکی و لێهاتوویت لێ دەبینم ، بڕۆ بۆ لای زاناکان و زانست وەرگرە .
ئەم قسەیە زۆر کاری تێکردم و بڕیارم دا ئەم قسەیەی جێبەجێ بکەم ، لە کۆتایی خوای گەورە سوودی پێ گەیاندم بە گوێڕایەڵی کردنم بۆ ئەم زانا گەورەیە .
دوای ئەمە و لە سەرەتای دەست پێکردنم بۆ داوا کردنی زانست ، خۆم خەریك کرد بە ( علم الکلام ) ، تا ڕۆژێکیان ئافرەتێك هاتە لام و پرسیارێکی لێکرم لە مەسەلەیەکی تەڵاق ، منیش نەمزانی چۆن وەڵامی بدەمەوە ، پێم وت : بڕۆ پرسیار

لە حەمماد بکە ، ئینجا وەڵامەکەم بۆ بێنەوە ، ئافرەتەکە چوو بۆ لای ئیمامی حەمماد و دوای کەمێك گەڕاوە و وەڵامی مەسەلەکەی پێ ڕاگەیاندم ، لەم کاتە لە دڵی خۆم وتم : واچاکە واز لەو زانستە بێنم و بچم لەلای حەمماد بخوێنم ، ئینجا دەستم کرد بە دانیشتن لە ئەڵقەی ئیمامی حەمماد ، بینیم ئیمام زۆر مەسەلەی بە قوتابیەکانی ئەفەرموو ، منیش هەمووم لەبەر دەکرد ، بەیانی کە لێی دەپرسینەوە ، من هەموو مەسەلەکانم بە جوانی و ڕێکی ئەهێنایەوە ، کە ئیمام زانی من زیرەکم فەرمووی : کەس بەرامبەرم دانەنیشێ تەنیا ئەبو حەنیفە نەبێ ، دوای ماوەیەك نەفسم پێی وتم : بۆچی ئەلقەیەکی زانست بۆ خۆت دروست ناکەی ؟! خۆ تۆش وەکو حەمماد زیرەکی !!!

بۆیە بڕیارم دا واز لە مەجلیسی ئیمامی حەمماد بێنم وبۆ خۆم ئەلقەیەکەی سەربەخۆ دابمەزرێنم !! بەڵام کە ئیمامم بینی شەرمم کرد و لە ئەلقەکەی دانیشتم ، کە ئیمام ویستی دەست بە دەرسەکەی بکا ، یەکێك هاتە لای و پێی وت : قوربان: ئەمشەو لە بەسرە فلانە خزمت وەفاتی کردووە ، لەم کاتە ئیمام پێی فەرمووم : ئەبو حەنیفە : وەرە لە جێگەم دانیشە و دەرس بڵێوە تا دەگەڕێمەوە !

ئیمامی حەمماد نزیکەی دوو مانگ نەگەڕاوە ، لەم کاتە من دەرسم دەوتەوە و نزیکەی شەست فەتوام دا ، هەر فەتوایەکم بدابووایە ئەمنووسیەوە ، کە ئیمام گەڕاوە لە سەفەرەکەی ، ئەم فەتوایانەم نیشان دا ، لە ٤٠ فەتوا یەکڕا بوو لەگەڵم بوو و لە ٢٠ فەتوا لەگەڵم نەبوو ، لە دڵی خۆم دا وتم ، شەرت بێ لە خزمەتت بم تا ماوم ، نزیکەی ١٨ ساڵ لەگەڵی مامەوە تا وەفاتی کرد ڕەحمەتی خوی لێ بێ ، لەم کاتەوە تا ئێستا لە دوای هەر نوێژێك دوعای بۆ دەکەم .

# مامۆستاكانی ئیمام

ئیمامی هەیتەمی دەفەرموێ : ئیمام لە زۆر مامۆستا و زانای بەرێز عیلم و زانستی وەرگرتووە ، كە نزیكەی ٤٠٠٠ مامۆستا بوون ، ئەمانەش ناوی هەندێكیان :

- ئیمامی حەممادی كوڕی ئەبی سولەیمان : ئیمام زۆربەی زانستی لەم بەڕێزە وەرگرتووە .
- عەتائی كوڕی ئەبی رەباح .
- ئەبو ئیسحاقی سەبیعی فەرموودەناس .
- موحاریبی كوڕی دیسار .
- ئەلهەیسەمی كوڕی حەبیبی صەرواف .
- موحەممەدی كوڕی مونكەدیر .
- نافع : كە خزمەتكاری حەزرەتی عەبدوللای كوڕی ئیمامی عومەرە خوا لە هەردووكیان رازی بێ .
- هیشامی كوڕی عوروە .
- سیماكی كوڕی حەرب .
- ئیمامی شەعبی .
- ئەلحەكەمی كوڕی عوتەیبە .
- قەتادەی كوڕی دەعامە ، ئەبو خەتتابی سەدوسی بەسری .
- ئیمامی ئەبو جەعفەری باقر ، موحەممەدی كوڕی عەلی كوڕی ئەلحوسەینی كوڕی ئیمامی عەلی كوڕی ئەبی تالیبە خوا لە هەموویان رازی بێ .
- ئیمامی زوهری .

- ئیمامی عیکریمە خزمەتکاری حەزرەتی ئبن عەبباس خوا لێی رازی بێ .
- یەحیای کوڕی سەعیدی ئەنصاری فەرموودەناس .
- سەلەمەی کوڕی کوهەیلی حەزرەمی .
- قەیسی کوڕی موسلیم .
- یەزیدی فەقیر .
- عەلقەمەی کوڕی مەرسەد .
- عەتییەی عەوفی .
- عەبدولعەزیزی کوڕی روفەیع .
- عەبدولکەریمی ئەبو ئومەیە .
- عەبدولرەحمانی کوڕی هورموزی ئەعرەج .
- عەدی کوڕی سابیت .

زۆر زانای تریش .

## میحنەتی ئیمام

ئبن هەبیرە کە والی عیراق بوو داوای لە ئیمام کرد ببێتە سەرپەرشتیاری بەیتولمالی موسڵمانان ، بەڵام ئیمام داواکاریەکەی رەت کردەوە .

ئبن هەبیرە کە رەتکردنەوەی ئیمامی بیست دوو هەفتە بەندی کرد و چواردە قامچی لێدا !!

دوای ئەم رووداوە ئیمام زیاتر ناوبانگی دەکرد بە زانست و تەقوا ، خەلیفە ئەبو جەعفەری مەنسور لە شاری کووفە هێنایە شاری بەغدا و ویستی بیکاتە قازی بەغدا، بەڵام ئیمام رازی نەبوو !!!

خەلیفە وتی : سوێند بەخوا دەبێ ئەم کارە بکەی .

ئیمام فەرموی : سوێند بەخوا نایکەم !!

خەلیفە دووبارەی کردەوە و وتی : سوێند بەخوا دەبێ ببی بە قازی بەغدا .

ئیمام فەرمووی: سوێند بەخوا ئەم کارە ناکەم .

ئەلرەبیعی کوڕی یونس وتی : چۆن ئەمە دەڵێی ئیمام !! ئەی گوێت لێ نیە خەلیفە سوێند دەخوا !!

ئیمام فەرمووی : خەلیفە زیاتر لەمن دەتوانێ کەففارەتی سوێندەکەی بدات !!

لەم کاتە خەلیفە فەرمانەی دا ئیمام بەند بکرێ ، یەکسەر ئیمام خرایە بەندیخانە .

دوای ماوەیەك خەلیفە بانگی کردەوە و وتی : ئێستا چی دەڵێی ؟ نابی بە قازی بەغدا ؟

ئیمام فەرموی : نەخێر !! ئەی ئەمیری ئیماندارن : لە خوای گەورە بترسێ !! ئەگەر لەناو رووباری فورات نوقمم بکەی بەم کارە رازی نابم ، من بۆ ئەم کارە دەست نادەم !!

خەلیفە تووڕە بوو وهاواری کرد : درۆ دەکەی !!! تۆ چاکترین کەسی بۆ قازیەتی !!

لەم کاتە ئیمام فەرمووی : ئەی خەلیفەی موسڵمانان : وا بە خۆت بڕیارت دا ، ئەگەر من مرۆڤێکی درۆزن بم ، چۆن درۆزنێك دەکەی بە قازی ، ئەگەر راستگۆش بم ئەوا پێم وتی من بۆ ئەم کارە دەست نادەم !!

خەلیفە بەم وەڵامەی ئیمام زۆر بەست بوو ، دوای کەمێك وتی : بیبەنەوە بەندیخانە !!!

ئیمامیان جارێکی تر بردەوە بەندیخانە .

# ئایا ئیمام صەحابەی بینیوە یان نا ؟

لەسەردەمی ئیمام چوار صەحابەی پێغەمبەر ﷺ لە ژیاندا بوون ئەوانیش : حەزرەتی ئەنەسی کوڕی مالك و عەبدوللای کوڕی ئەبی ئەوفا لە شاری کوفە ، هەروەها حەزرەتی سەهلی کوڕی سەعدی ساعدی لە مەدینە و ، حەزرەتی ئەبولتوفەیل لە شاری مەککە خوا لێیان رازی بێ .

دەربارەی بینینی ئیمام بۆ ئەم صەحابانە سێ راو بۆچوون هەیە :

١ـ هەندێ زانا دەفەرموون : هیچ لەم صەحابانەی نەبینیوە .

٢ـ هەندێکی تر دەفەرموون : بەلکو هەموویانی بینیوە .

٣ـ هەندێ زاناش دەفەرموون : تەنیا حەزرەتی ئەنەسی کوڕی مالکی بینیوە .

بۆچوونی سێیەمیش لە هەموویان راسترە ، چونکە ئیمام خۆی دەفەرمووێ : حەزرەتی ئەنەسم بینی لە مزگەوت نوێژی دەکرد .

بەلام دەبێ ئەوەش بزانین کە ئیمام زانست و فەرموودەی لەم بەڕێزە وەرنەگرتوە ، تەنیا بینیوێەتی هیچی تر نا[10] .

---

[10] لێرەدا یەیتم ئیمامی هەیتەمی لە کتێبی ( الخیرات الحسان ) فەرموویەتی : من وای بۆ دەچم ئیمام جگە لە حەزرەتی ئەنەس صەحابەی تریشی بینیێ ، و الله أعلم .

# کتێبەکانی ئیمام

ئیمامی ئەبو حونیفە چەند کتێبێکی داناوە ، لەوانە :

١ـ المُسْنَد : کە تایبەتە بە فەرموودە[11] .

٢ـ الفقه الأكبر : کە تایبەتە بە عەقیدە .

٣ـ الرد على القدرية .

٤ـ العالم و المتعلم[12] .

# زیرەکی ئیمام

- پیاوێك هەبوو لە سەردەمی ئیمام لە شاری کووفە دەیوت : عوسمانی کوڕی عەففان پیاوێکی جوولەکە بوو !!!!

ئیمام هاتە لای و فەرمووی : من هاتوومە کچی جەنابت بۆ پیاوێکی وا بخوازم کە دەوڵەمەندە و هەموو قورئانی لەبەرە و مرۆڤێکی زۆر بەخشەرە و شەونوێژ دەکا و بەردەوام دەگری لە ترسی خوا .

پیاوەکە وتی : ئەگەر تەنیا یەك سیفەتی تیا بێ لەم سیفەتانە بەسە .

ئیمام فەرمووی : بەڵام خەسڵەتێکی تیایە .

پیاوەکە وتی : چیە ؟

ئیمام فەرمووی : ئەو پیاوە جوولەکەیە !!!

---

[11] ئەم کتێبە لە کتێبخانەی گشتی شاری هەولێر هەیە بە ژمارەی ١١٣٤/ کتێبی ئاینی .

[12] ئەم کتێبانە د. محمد یوسف لە کتێبەکەی ( أبو حنیفة / ٤٠ ) باسی کردوون .

پیاوەکە وتی : ئەوە چی دەڵێی ئیمام ؟! چۆن کچی خۆم لە پیاوێکی جوولەکە مارە دەکەم !!!

ئیمام وتی : مانای وایە تۆ رازی نی ؟

پیاوەکە وتی : من هەرگیز رازی نابم بەمە !!!

ئیمام فەرموی : بەڵام پێغەمبەر ﷺ دوو کچی خۆی لە پیاوێکی جوولەکە مارە کرد[13] !!

لەم کاتە پیاوەکە وتی : استغفر الله ! من تۆبە دەکەم و دەگەڕێمەوە لەو بوختانەی بە حەزرەتی عوسمانم کرد بوو خوا لێی رازی بێ .

- جاریکیان زەححاکی شاری کە یەکێك بوو لە سەرانی خەواریج هاتە لای ئیمام و پێی وت : ئەبو حەنیفە : تۆبە بکە !!!

ئیمام وتی : لەچی ؟

زەححاك وتی : لەو بیروباوەڕەت کە دەڵێ : عەلی راست کرد بەوەی رازی بوو بە ناوبژیوانی ئەبو موسای ئەشعەری و عەمری کوڕی عاص !!!

ئیمام فەرمووی : حەزت لێیە گفتوگۆیەك بکەین لەسەر ئەم مەسەلەیە ؟

زەححاك وتی : بەڵێ .

ئیمام فەرمووی : بەڵام دەبێ یەکێك بێتە ناوبژیوان تاکو بڕیار بدا کێ سەرکەووتوە .

زەححاك وتی : زۆر چاکە ، بۆ خۆت یەکێك دابنێ .

ئیمام فەرمووی : با لەو پیاوە بێتە ناوبژیوان لە نێوانمان .

ئیمام ئاماژەی بۆ هاورێیەکی زەححاك کرد .

زەححاك وتی : رازیمە .

---

[13] مەبەستی ئیمام ئەوە بوو کە پێغەمبەر ﷺ دوو کچی لە حەزرەتی عوسمان مارە کرد کە پیاوەکە بە جوولەکە ناوزەدی دەکرد !

لەم کاتە ئیمام فەرمووی : لەی ئێستا چی بەخۆت دەڵێی ؟ بۆچی تۆ راست دەکەی کاتێ ئەم پیاوەت کرد بە ناوبژیوان ؟ بەڵام ئیمامی عەلی راست ناکات کاتێ رازی بوو بە ناوبژیوانی حەزرەتی ئەبو موسای ئەشعەری و عەمری کوڕی عاص ؟!!

لەو کاتە زەححاك هیچی پێ نەما وشەیەکی لەدەم دەرنەچوو و دۆڕاندنی .

- پیاوێك ویستی زیرەکی ئیمام تاقی بکاتەوە ، لێی پرسی : چی دەڵێی دەربارەی مرۆڤێك بەتەمای بەهەشت نەبێ و لە ئاگری دۆزەخ نەترسێ و لە خوای گەورەش نەترسێ و شاهێدی بدا لەسەر شتێك کە نەیدیبێ و رقی لە حەق بێتەوە و فیتنەی خۆش بوێ و باوەڕ بو جوولەکە و دیانەکان بکات و مرداریش بخوا و نوێژ بێ سوجدە وروکوع بکا و خۆی لە رەحمەت دوور بخاتەوە ؟!!

ئیمام لە قوتابیەکانی پرسی : چی دەڵێن دەربارەی ئەو مرۆڤەی ئەم سیفەتانەی تیایە ؟

وتیان : خراپترین مرۆڤە .

ئیمام فەرمووی : بەڵکو ئەمە یەکێکە لە ئەولیاکان !! چونکە بەتەمای خوای بەهەشتە نەك بەهەشت و لە خوای گەورە دەترسێ نەك لە دۆزەخ و لە خوای گەورە ناترسێ زوڵمی لێ بکا و ماسی مردار دەخوا و نوێژی مردوو دەکات بێ سوجدە و روکوع و شاهێدی دەدا خوای گەورە شایەنی پەرستنە و حەزرەتی موحەممەد پێغەمبەری خوایە و رقی لەحەقە کە مردنە تا زیاتر خوای گەورە بپەرستێ و حەزی لە فیتنەیە کە ماڵ و منداڵە و خۆی لەرەحمەت دوور دەخاتەوە کە بارانە و باوەڕ بەدیانەکان دەکا کە دەڵێن جوولەکە لەسەر هەق نین و باوەڕ بە جوولەکەکان دەکا کە دەڵێن دیانەکان لەسەر حەق نین !!!

لەم کاتە پیاوەکە سەری ئیمامی ماچ کرد و وتی : شاهێدی دەدەم تۆ لەسەر هەقی .

- جارێکیان گەنجێك هاتە خزمەت ئیمام و پێی وت : قوربان : من چووم بۆ خوازبێنی کچێك بەلاّم کەس و کارەکەی داوای پارەیەکی زۆریان کردووە، رات چیە ؟ بیهێنم یان نا ؟

ئیمام دوای نوێژی ئیستیخارە پێی وت : بەڵێ بیهێنە .

گەنجەکە دوای چەند رۆژێك هاتەوە خزمەتی و پێی وت : من کچەکەم مارە کرد ن بەلاّم کەس و کاری رازی نابن بیگوازمەوە تا مارەییەکەی بە تەواوی نەدەم ، چی بکەم ئێستا ؟!!

ئیمام فەرمووی : من ئەم پارەیەت پێ ئەدەم بەقەرز ، دوای گواستنەوە وەرەوە لام .

گەنجەکە فەرمانەکەی جێ بەجێ کرد ئینجا گەڕاوە لای ئیمام و تی : قوربان : هەمرو فەرمانەکانتم جێبەجێ کرد .

ئیمام فەرمووی : ئێستا وا نیشان بدە کە تۆ ژنەکەت لەگەڵ خۆت دەبەی بۆ دەرەوەی شار ، با بزانین چی دەبێ ؟

گەنجەکەش وای کرد ، کە کەس و کاری ژنەکە ئەمەیان زانی زۆریان پێ ناخۆش بوو چونکە کچەکەی خۆیان زۆر خۆشدەویست ، بۆیە هاتنە لای ئیمام و بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕاوە و وتیان : قوربان نەهێڵی ئەم پیاوە کچەکەمان لێ دوور بخاتەوە .

ئیمام وتی : ئەم پیاوە دەتوانێ ژنەکەی بۆ هەمرو شوێنێك لەگەڵ خۆی ببا و ناتوانم رێی لێ بگرم .

کەس وکارەکە وتیان : ئەی چی بکەین ئێستا ؟!

ئیمام فەرمووی : ئەگەر مارەییەکەی بدەنەوە من هەوڵ دەدەم لەم بڕیارەی پاشگەزی بکەمەوە .
وتیان : ئێمە رازین !
کە گەنجەکە ئەمەی زانی وتی : من رازی نابم تا زیاترم پێ نەبەخشن !!
لەم کاتە ئیمام تووڕە بوو و فەرمووی : ئەم کارە نەکەی ، دەزانی ئەگەر لەم ئافرەتە وتی : من قەرزدارم ... تۆ ناتوانیێ لەگەڵ خۆتی ببەی بۆ هیچ شوێنێك !!
گەنجەکە کە ئەمەی بیست زوو پەشیمان بۆوە و وتی : توخوا ئەم قسەیە مەکە ! من رازیم بە هەموو قسەکانت !!

- پیاوێك هاتە خزمەت ئیمام و پێی وت : بڕێك پارەم لە شوێنێك دانابوو ، بەڵام لەیادم چووە کامە شوێنە !! چی بکەم تا بێتەوە یادم ؟!!!

فەرمووی : بگەڕێوە ماڵەوە و دوای عیشا تا بەیانی نوێژ بکە ، بەویستی خوا دێتەوە یادت .
پیاوەکە پێشنیارەکەی ئیمامی جێبەجێ کرد ، دوای ماوەیەکەی کەم لە نوێژ کردن شوێنەکەی هاتەوە یاد و پارەکەی دۆزیەوە ، دوای ئەمە خەوت ! بۆ بەیانی چووە لای ئیمام و بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕاوە .
ئیمام فەرمووی : دەمزانی شەیتان ناهێڵێ زۆر نوێژ بکەی ، چیت لێ دەهات ئەگەر ئەم شەوەت تەواو بکردبایە بە شەونوێژ و سوپاسی خوای گەورەت بکردایە !!!

- شەوێکیان کۆمەڵە دزێك چوون بۆ ماڵی یەکێك و هەرچی شتی بەنرخ بوو دزیان و وایان لە خاوەن ماڵەکە کرد بڵێ : ئەگەر بەکەسم وت ئێوە دزیتان لەمن کردووە ئەوا هەرسێ تەلاقم بکەوێ !!!

بەیانی پیاوەکە بینی دزەکان وا ماڵەکەی لە بازار دەفرۆشنەوە و نەشیدەتوانی قسە بکات لەبەر تەلاق کەوتنەکەی ، زوو چووە لای ئیمام و مەسەلەکەی بۆ گێڕاوە .
ئیمام فەرمووی : هەڵسە هەموو پیاوانی گەڕەکەکی خۆتم بۆ کۆبکەرەوە .
پیاوەکە فەرمانەکەی ئیمامی جێبەجێ کرد ، کە هەموویان کۆبوونەوە ئیمام فەرمووی : یەك یەك وەرنە پێش .
ئینجا بە پیاوەکەی وت : هەر کەسێ هاتە پێش و دزەکە نەبوو تۆ بڵێ : ئەمە دزەکە نیە ، ئەگەر دزەکەش بوو تۆ بێ جوولە بوەستە و وشەت لە دەم دەرنەچێ !!
پیاوەکە وتی : بەسەرچاو .
ئینجا پیاوەکان یەك یەك دەهاتنە پێش تا نۆرەی دزەکان هات ، کە گەیشتنە لای ئیمام پیاوەکە بێ جوولە وەستا ، خەڵکەکە زانیان ئەمانە دزەکانن و زوو دەستگیریان کردن و کەل و پەلەکەی پیاوەکە بۆی گەڕاوە و تەلاقەکەی نەکەوت !!!

- پیاوێك هاتە خزمەت ئیمام و وتی : ئەمشەو شتێکی زۆر بەنرخم لێ دزراوە ، چی بکەم تا بیگەڕێنمەوە ؟!

ئیمام فەرمووی : جارێ بێ دەنگ بە تا نوێژی بەیانیم لەگەڵ دەکەی .
کە نوێژیان تەواو کرد ، ئیمام روو کردە خەڵکەکە و فەرمووی : ئەو کەسە شەرم ناکات بەشەو شت لە ماڵی برای دەدزێ و بەیانی نوێژ لەگەڵ خەڵك دەکات کەچی هێشتان تۆزی شتە دزراوەکە لەسەر سەری ماوە !!
لەو کاتە پیاوێك دەستی بەسەر سەری خۆی داهێنا .
ئیمام فەرمووی : ئێستا زانیم کە تۆ شتەکەت دزیوە !!!

# قوتابیەکانی ئیمام

ئیمامی هەیتەمی دەفەرمووێ : ئیمام زۆر قوتابی لە ژێر دەستی بوون بە زانای گەورە ، ژمارەیان نزیکەی ٨٠٠ کەس بوو ، لەمانەش ناوی هەندێك لەو قوتابیانەیە :

١- ئیمامی موحەممەدی کوڕی حەسەنی شەیبانی .

١- ئیمامی ئەبو یوسف[١٤] .

٣- ئیمامی ئیبنولموبارەك .

٤- ئیمامی وەکیعی کوڕی جەڕاح .

٥- ئیمامی ئەعمەش .

٦- ئیمامی فوزەیلی کوڕی عیاز .

٧- یەحیای کوڕی مەعینی فەرموودەناس .

٨- ئیمام زوفەری کوڕی هوزەیلی عەنبەری .

٩- ئیمامی عیسای کوڕی یونسی کوفی .

١٠- ئیمامی ئەبو مەسعودی ئەزدی موسلی .

١١- ئەبو عاصیمی نەبیلی فەرموودەناس : کە مامۆستاتی ئیمامی بوخاریە .

١٢- عەبدولڕەززاقی فەرموودەناس .

١٣- فەزلی کوڕی دوکەین : کە مامۆستای ئیمامی ئەحمەد و بوخاریە .

١٤- ئیمامی ئەبو ئیسحاقی فەزاری .

١٥- ئەبو خالیدی واسیتی فەرموودەناس : کە مامۆستای ئیمامی بوخاریە .

١٦- ئیمامی ئەبو حەمزەی سوککەری .

---

[14] ئەم دوو بەڕێزە نزیکترین قوتابی بوون لە ئیمام .

١٧ـ ئەبو عەبدیللای ئەنصاری : کە مامۆستای ئیمامی ئەحمەد و بوخاریە .

١٨ـ ئیمامی حەمزەی کوڕی حەبیبی زەییات : کە خاوەنی خوێندنەوەیەکی سەربەخۆی قورئانی پیرۆزە .

١٩ـ ئیمامی ئەبو سولەیمانی تائی .

٢٠ـ ئەبو یەحیای حیممانی .

٢١ـ هوشەیمی کوڕی بەشیری فەرموودەناس .

٢٢ـ عەبادی کوڕی عەووام .

٢٣ـ یەحیای کوڕی نەصر .

٢٤ـ عەمری کوڕی موحەممەدی عەنقەزی .

٢٥ـ هەوزەی کوڕی خەلیفە .

٢٦ـ ئەبو عەبدیلرەحمانی موقری .

٢٧ـ عەبدولرەززاقی فەرموودەناس .

٢٨ـ ئەسەدی کوڕی عەمر .

٢٩ـ ئەلحەسەنی کوڕی زیاد .

## ئیش و كاری ئیمام

ئیمامی ئەبو حەنیفە دوكانێكی بچكۆلانەی هەبوو تیایدا كوتاڵی دەكڕی و دەفرۆشت و لەسەر داهاتی ئەم كارەی بەرێوە دەچوو .

## ئایا هیچ فەرموودە دەربارەی ئیمامی ئەبو حەنیفە هاتووە ؟

ئیمامی سیوتی دەفەرموێ : فەرموودەی : ( لَوْ كَانَ العِلْمُ عِنْدَ الثُرَيَّا لَتَنَاوَلَهُ رِجَالٌ مِنْ أبْنَاءِ فَارِسَ )[15] بەلگەیەكی صەحیحە دەتوانین پشتی پێ ببەستین وبیكەین بە ئاماژەیەك بۆ عیلم و زانستی ئیمام .

## شێوەی ئیمام

ئیمام پیاوێكی نەكورت و نەدرێژ بوو ، رەنگی پێستیشی كەمێك ئەسمەر بوو ، لەهەموو كەسێك قسەی پاراوتر و دەم و چاو جوانتر بوو ، بەردەوام جل وبەرگی خاوێن و پوختی لەبەر دەكرد و بۆنی خۆشی لەخۆی دەدا و لەگەڵ برادەرانی باشترین كەس بووە ، ئیبن خەللیكان فەرموویەتی : ئەبو حەنیفە پیاوێكی دەم و چاو جوان و مەجلیس خۆش بوو ، برایەتی زۆر كەسی دەكرد زۆر بە چاكی ،

---

[15] أخرجه البخاري و مسلم و أبو نعيم و الشيرازي و الطبراني و أبو يعلى و البزار .

مانای فەرموودەكەش ئەوەیە : ئەگەر زانست لە ئەستێرە بڵندەكانی ئاسمان بووایە ، پیاوی وا لە فارسەكان هەیەدا دەبن دەتوانن بیگەنە ئەم زانستە .

مرۆڤێکی نەکورت و نەدرێژ و رەنگی کەمێك ئەسمەر بوو ، لەهەموو کەسێك قسەی خۆشتر بوو ، زانایەك بوو کاری بە زانستەکەی خۆی دەکرد لەگەڵ دونیانەویستی ، زۆر ملکەچی فەرمانەکانی خوای گەورە بوو و بەردەوام لە دوعا و پاڕانەوە بوو .

## ئەحوال و کەراماتی ئیمام

- کاتێك خەلیفە ئەبو جەعفەری مەنسوور فەرمانی دا ئیمام هیچی تر فەتوا نەدات ، شەوێکیان کچەکەی ئیمام پرسیاری لێ کرد وتی : باوکە گیان : ئەو خوێنەی لە نێوان ددانەکانی مرۆڤ دێتە خوارەوە دەست نوێژ دەشکێنێ یان نا ؟

ئیمام فەرمووی : کچی خۆم : برۆ بۆ لای حەمماد و ئەم پرسیارەی لێ بکە ، چونکە خەلیفە منی قەدەغە کردووە لە فەتوا دان ، منیش ئەو کەسە نیم کە بە نهێنی فەرمانەکانی خەلیفەی موسڵمانان بشکێنم !!

- ئیمام لە ژێر سێبەری داری ئەو کەسە دانەدەنیشت کە خاوەنەکەی قەرزداری بووایە و دەیفەرموو : هەر قەرزێك سوودێکی لەگەڵ خۆی هێنا بۆ قەرزدەرەکە دەبێتە ریبا !!!
- ئیمام حەوت هەزار جار قورئانی ختم کردووە تەنیات لەو شوێنەی کە تیایدا وەفاتی کردووە !!
- کاتێك قازی شورەیح وەفاتی کرد رەحمەتی خوای لێ بێ چوار کەسیان داوا کرد بۆ ئەوەی بین بە قازی : ئیمامی ئەبو حەنیفە و سوفیانی سەوری و صیلە

و شەریك ، ئیمام فەرمووی : لەسەر ئەم مسەلەیە من بەند دەكرێم و سوفیان هەڵدێ و صیلە خۆی لێ رزگار دەكات بەڵام شەریك پێوە دەبێ !

ئەم قسەیەی ئیمام بە تەواوی هاتە جێ : بەخۆی بەندكرا و سوفیانی سەوریش هەڵات و صیلەش خۆی لێ دەرباز كرد بەڵام شەریك بەناچاری كرا بە قازی !

- ئیمام لە سەرەتاكانی ژیانی خەونی بینیی كە قەبری پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ هەڵئەداتەوە ، ئەم خەونەی بۆ ئیمامی ئیبن سیرین گێڕاوە .

ئیمامی ئیبن سیرین فەرمووی : خاوەنی ئەم خەونە زانستێكی وا پەیدا دەكات كە كەس لەوەو پێش پەیدای نەكردووە .

- ئیمام ناوی لێنرابوو كۆڵەگە ، ئەوەندەی بوەستێ لەشەونوێژ و ، هەندێ زانا دەفەرموون : ئیمام ٤٥ ساڵ هەر پێنج نوێژی بەیەك دەست نوێژ دەكرد .
- ساڵێكیان مەڕی خەڵكی كوفە و مەڕی رەوەندەكان تێكەڵاو بوو ، ئیمام لە هەندێكیانی پرسی : مەڕ چەند ساڵ دەژی ؟

وتیان : حەوت ساڵ .

لەبەر ئەوە ئیمام حەوت ساڵ گۆشتی مەڕی نەخوارد نەوەك حەرام بوو بێ !!

- ئەبولعەبباسی تووسی زۆر رقی لە ئیمام بوو ، جارێكیان لە لای خەلیفە ئەبو جەعفەری مەنسوور دانیشتبوو ، لەم كاتە ئیمام هاتە ژوورەوە ، ئەبولعەبباس بە نزیكەكانی وتی : ئیمڕۆ ئەبو حەنیفە بەكوشتن دەدەم !!

رووی كردە ئیمام و لێی پرسی : ئەبو حەنیفە : ئەمیری ئیمانداران هەندێ جار لە ملی هەندێ كەس دەدا بەبێ ئەوەی بزانێ چی كردووە ؟ ئەمە هەقە یان نا ؟

ئیمام وتی : ئەبولعەبباس : باوەڕت چۆنە ؟ ئەمیری ئیمانداران بەهەق یان بە ناهەق خەڵك دەكوژێ ؟

وتی : بەحەق .

ئیمام وتی: كەواتە حەق بینە و لێی مەپرسە !!

ئەبولعەبباس کە گوێی لەمە بوو بێ دەنگ بوو و هیچ قسەی نەکرد !!
ئیمام بە نزیکەکانی خۆی فەرموو : پێش ئەوەی بمبەستێتەوە پەلبەستم کرد .

- یەزیدی کوڕی کومەیت فەرموویەتی : ئیمام مرۆڤێکی لەخواترس بوو ، جارێکیان نوێژی عیشای کرد لەدوای عەلی کوڕی حوسەینی موئەززین ، ئەم پێشنوێژە سورەتی ﴿ إذَا زُلْزِلَتِ ﴾ خوێندەوە ، کاتێك نوێژ تەواو بوو هەموو خەڵك چوونە دەرەوە ، سەیرم کرد ئیمام دانیشتووە و بیر دەکاتەوە ، لەدڵی خۆم وتم : با هەڵسم نەوەك دڵی ئیمام بە من خەریك بێ ، هەڵسام و چرایەکەم نەکوژاندەوە هەرچەند زەیتی کەم تیا مابوو ، بەیانی بۆ نوێژ هاتمەوە بینیم ئیمام وا وەستاوە و ردێنی خۆی گرتووە و دەڵێ : ئەی ئەو پەروەردگارەی پاداشت وسزای کەمترین شت نەدەیتەوە ، نوعمانی بەندەت رزگار بکە لە ئاگری دۆزەخ و لەرەحمەتی خۆتی بێ بەش مەکە !

منیش تەماشای چرایەکەم کرد بینیم زۆر بەچاکی دادەگیرسێ ، دوای ئەمە ئیمام رووی کردە من و فەرمووی : ئەو شتە بشارەوە وبەکەس مەڵێ ، ئینجا دوو رەکعەت سونەتی کرد و لەدوای ئەمە نوێژی بەیانی بە دەست نوێژی عیشای لەگەڵمان بە جەماعەت کرد !!

- عەبدوڵلای کوڕی رەجا فەرموویەتی : ئیمام دراوسێیەکی هەبوو ، بەرۆژ ئیشی دەکرد و بە شەوان مەی دەخواردەوە تا مەست دەبوو ، ئینجا بەدەنگێکی بەرز هاواری دەکرد و دەیوت :

أضَاعُوني و أيَّ فَتىً أضَاعُوا
لِيَومِ كَرِيهَةٍ و سَدَادِ ثَغرِ[16]

---

[16] واتە : قەومەکەی من وازیان لێ هێنام و لە من بەری بوون ، کەچی من لە شەڕو کاتی ناخۆشی باشترین پیاوم !!

هەر ئەیلواردەوە و بەردەوام ئەم دێرە شیعرەی دووبارە دەکردەوە تا دەخەوت ، ئیمامیش گوێی لەمە دەبوو لە شەونوێژەکەی ، تا شەوێکیان ئیمام دەنگی دراوسێیەکەی نەبیست وەکو جاران هاوار بکات ، بۆ بەیانی لە هۆی بێ دەنگ بوونی پرسی ؟
بە ئیمامیان وت : پاسەوانەکانی شەو دەستگیریان کردووە و ئێستاش بەند کراوە .
ئیمام چوو بۆ لای گەورەی شارەکە و ئیزنی چوونە ژوورەوەی وەرگرت ، ئەمیری شار کە ناوی ئیمامی بیست فەرمانی دا وتی : با بێتە ژوورەوە بە سواری و مەهێڵن لە ولاغەکەی بێتە خوارەوە تاوەکو بەسەر فەرشمان دەکەوێ !!
کە ئیمام هاتە ژوورەوە ئەمیرەکە بەخێرهاتنی کرد وتی : چ خزمەتێك هەیە بۆ ئیمام جێبەجێ بکەین ؟
ئیمام فەرمووی : دراوسێیەکم هەیە گیراوە ، حەز دەکەم فەرمان بدەن لە بەندیخانە ئازاد بکرێ .
ئەمیرەکە وتی : بەسەرچاو قوربان ! لەبەر خاتری جەنابت ئەوەی لەو شەوە تا ئێستا گیراوە ئازای دەکەین .
کاتێك ئیمام چووە دەرەوە لەگەڵ دراوسێکەی ، پێی وت : ئایا وازمان لێ هێناوی و لێت بەرین ئێستا ؟!!
پیاوەکە وتی : نەخێر ئەی چاکترین دراوسێ وازتان لەمن نەهێناوە و لێم بەری نین !!
ئینجا پیاوەکە تۆبەی کرد و وازی لە کردەوە خراپەکانی هێنا .

- ئیمامی ئەبو یوسف فەرموویەتی : جارێکیان لەگەڵ ئیمام بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشتین ، لەناکاو پیاوێك وتی : ئەمە ئیمامی ئەبو حەنیفەیە کە هەموو شەوان تا بەیانی شەونوێژ ئەکا و ناخەوێ !

که ئیمام گوێی لەمە بوو فەرمووی : نابێ خەڵك مەدحی من بکەن بە شتێك کە تیام نەبێ .
لەو کاتەوە تا وەفاتی کرد هەموو شەوێك لەسەر خۆی واجب کرد تا بەیانی شەونوێژ بکا و نەخەوێ !!!

- وەکیعی کوڕی جەراح فەرموویەتی : ئیمام لەسەر خۆی واجب کرد بوو ئەگەر سوێند بخوات درهەمێك بکاتە خێر ، هەرکاتێ سوێندی بخواردایە درهەمێکی دەکردە خێر ، دوای ماوەیەك لەسەر خۆی واجب کرد هەر کاتێ سوێند بخوات دینارێك بکاتە خێر ، دوای ئەمە هەر سوێندێکی بخواردایە دینارێکی دەکردە خێر ، هەروەها چەند پارەی بۆ ماڵ و منداڵی سەرف بکردایە ئەوەندەشی بۆ هەژار و کەم دەرامەتان سەرف دەکەرت ، ئەگەر جل و بەرگێکی نوێی لەبەر بکردایە ، هەمان جلیشی بە زانایەك دەبەخشی ، ئەگەر خواردنێکی لەپێش دانرا بووایە ، ئیوەی بۆ هەژاران دەنارد .
- موحەممەدی کوڕی شوجاع فەرموویەتی : گوێم لە حەمیان بوو دەیفەرموو : جارێکیان ئافرەتێك هاتە لای ئیمام و پێی وت : ئەم کراسەم لێ دەکڕی ؟

ئیمام فەرمووی : بە چەند ئەیفرۆشی ؟
ئافرەتەکە وتی : ١٠٠ درهەم .
ئیمام فەرمووی : ئەم کراسە نرخەکەی زیاترە .
ئافرەتەکە وتی : بە ٢٠٠ درهەم .
ئیمام فەرمووی : ئەم کراسە نرخەکەی زیاترە .
ئافرەتەکە وتی : بە ٣٠٠ درهەم .
ئیمام فەرمووی : ئەم کراسە نرخەکەی زیاترە .
ئافرەتەکە وتی : بە ٤٠٠ درهەم .

ئیمام فەرمووی : ئەم کراسە نرخەکەی زیاترە ، بەلاّم من بە ٤٠٠ درهەمم دەویّ .

- خالیدی بەلەوی فەرموویەتی : جارێکیان کابرایەك هاتە لای ئیمام و وتی : من دوو کراسم دەوێت بۆ دایك و هاوسەرم ، بۆم پەیدا بکە و کڕین و فرۆشتنێکی جوانم لەگەلّ بکە .

ئیمام فەرمووی : چۆن بێ و چ ڕەنگێك بێ ؟

پیاوەکەش کراسەکانی بۆ وەسف کرد .

ئیمام فەرمووی : دوو هەفتەی تر وەرەوە لام بۆت پەیدا دەکەم .

پیاوەکە وتی : زۆر چاکە .

لە دوای تێپەڕ بوونی دوو هەفتە ، پیاوەکە هاتە لای ئیمام ، ئیمامیش دوو کراسەکەی پێ دا لەگەلّ دینارێك و پێی وت : دلّنیا بە من زەرەرم نەکردووە ، من ئەو دوو کراسەم بۆ هەلّگرتی و خوای گەورە قازانجی پێ بەخشیم ، جا سوپاسی خوای گەورە بکە .

منیش پێم وت : ئیمام : ئەم پیاوەت دەناسی ؟

فەرمووی : نەخێر ، بەلاّم گوێت لێ نەبوو پێی وتم : بە جوانی کڕین و فرۆشتنم لەگەلّ بکە ، لەبەر ئەوە ئاوام لەگەلّ کرد !!!

- عەلی کوڕە حەفصی بەززار فەرموویەتی : حەفصی کوڕی عەبدولڕەحمان شەریکی ئیمام بوو ، جارێکیان هەندێ کراسی کڕی ، بە حەفصی وت : یەکێك لەم کراسانە عەیبدارە ، جا مەیفرۆشە تا عەیبەکە بۆ کڕیارەکە دیار دەکەی .

دوای ماوەیەك پیاوێك هات و کراسەکانی بەیەکەوە کڕی بەلاّم حەفص لەبیری چوو عەیبەکە بۆ کڕیارەکە دیاری بکات ! کە ئیمام لەمەی زانی هەموو پارەکەی کردە خێر !!!

- جارێکیان پیاوێك هاتە لای ئیمام و پێی وت : من پێویستم بە کراسێك هەیە .

ئیمام وتی : ڕەنگی چۆن بێ ؟

پیاوەکەش بۆی روون کردەوە .

ئیمام فەرمووی : ماوەیەك سەبر بگرە تا دەکەوێتە لام و بۆت هەڵیدەگرم !

دوای هەفتەیەك پیاوەکە گەڕاوە لای ئیمام ، ئیمام پێی فەرموو : فەرموو ئەوە ئەو کراسەیە کە داوات کرد بوو .

پیاوەکە سەیری کراسەکەی کرد و زۆر پێی چاك بوو ، وتی : نرخەکەی چەندە ؟

ئیمام فەرمووی : یەك درهەم !

پیاوەکە وتی : چیە ؟! گاڵتەم پێ دەکەی ؟!!

ئیمام فەرمووی : نەخێر ! بەڵام مەسەلەکە ئەوەیە کە پیاوێك هاتە لام و دوو کراسی پێ فرۆشتم بە بیست دینار و درهەمێك ، کراسێکم بە بیست دینار فرۆشت و ئەو کراسەش بە درهەمێك دەفرۆشم چونکە تۆ هاورێمی و من قازانج لە برادەرم وەرناگرم !!

- ئیمامی ئەبو یوسف فەرموویەتی : ئیمامی ئەبو حەنیفە پێی وتم : لە ئاینی خوا پرسیارم لێ مەکە لەو کاتەی لە رۆیشتنام و لەو کاتەی بەپێوە وەستاوم و لەو کاتەی پاڵم داوەتەوە ، چونکە پیاو بە تەواوی ئەقڵی لای خۆی نیە لەو کاتانە !!

- ئیمام کاتێك پێی گەیشتبا یەکێك غەیبەتی کردووە ، کەسێکی بۆ دەنارد پێی بڵێ : خوا لێت خۆش بێ برام ، تۆم دا دەست خوایەکی وا کە ئەزانێ ئەم شتەی تۆ باست کردووە لەمن دا نیە !!

- یوسفی سەمتی فەرموویەتی: خەلیفە ئەبو جەعفەری مەنصوور سەد هەزار درهەمی بە ئیمام بەخشی کاتێك هاتە شاری بەغدا ، ئیمام فەرمووی : ئەی

گەورەی ئیمانداران من تازە هاتوومە شاری بەغدا ، ئەم سەد هەزارەم بۆ هەڵگرە لە بەیتولمال تا ئەو کاتێ دەگەڕێمەوە .

خەلیفە وتی : زۆر چاکە .

بەڵام کە ئیمام وەفاتی چەندین پارە و ئەمانەتی لە ماڵی چووە دەرەوە و گەڕاوە لای خاوەنەکانیان ، کە خەلیفەی ئەمەی زانی وتی : ئەبو حەنیفە فێڵی لێ کردین، بەمنی وت : با ئەم سی هەزار دینارە لە بەیتولمال بێ تا دەردەچم ، کەچی وا دبینم ئەم هەموو ماڵ و سامانە لە ماڵێ بە ئەمانەت دانراوە !!

- ئەحمەدی کوڕی موحەممەد فەرموویەتی : گوێم لە باوکم بوو دەیفەرموو : لە خەونمدا موحەممەدی کوڕی حەسەنم بینی ، لێم پرسی : چیت بەسەرهات ؟

  فەرمووی : خوای گەورە لێم خۆش بوو .

وتم : بە هۆی چی ؟

فەرمووی : بە منی فەرموو : ئەم زانستەمان پێنەبەخشی مەگەر لێت خۆش نەبووباین .

وتم : ئەی ئەبو یوسف ؟

فەرمووی : بە پلەیەك لە من بەرزترە .

وتم : ئەی ئیمامی ئەبو حەنیفە ؟

فەرمووی: لە پلە بەرزەکانی بەهەشتە !

- ئیمامی ئیبنولموبارەك فەرموویەتی : جارێکیان لە مزگەوت دانیشتبووین : لەناکاوێك مارێك کەوتە خوارەوە ، لە ترسان هەموومان دەرچووین لە مزگەوت تەنیا ئیمامی ئەبو حەنیفە نەبێ ، چی نەکرد تەنیا لەوەندە نەبێ مارەکەی لادا و گەڕاوە شوێنی خۆی ودانیشت !!

- پیاوێك بە جێگایەك تێپەڕی کە ئافرەتێکی شێتی لێ بوو ، ئافرەتەکە هەر کە پیاوەکەی بینی پێی وت : ئەی کوڕی دایك و باوکە زیناکەرەکە !!!

لەهەمان کات ئیمامی ئیبن ئەبی لەیلا ئامادەبوو ، بە پیاوەکەی فەرموو : برۆ لەم ئافرەتە بێنە ناو مزگەوت تا حەددی بوختانی لێ دەربکەین !

کە ئافرەتەکەی هێنا ، ئیمامی ئیبن ئەبی لەیلا دوو حەددی لێ دەکرد ، یەکێکیان هی باوکی و ئەوی تر هی دایکی !

کە ئەم هەواڵە گەیشتە ئیمامی ئەبو حەنیفە فەرمووی : ئیبن ئەبی لەیلا لە شەش لایەن هەڵەی کرد : یەکەمیان : لە مزگەوت حەددی لێ دەکرد ، کەچی مزگەوت شوێنی ئەمە نیە .

دووەمیان : ئافرەتەکە بە پێوە بوو کاتێك حەددەکەی لێ دەرکرا ، کەچی دەبێ ئافرەت بە دانیشتوویی حەددی لێ دەرکرێ .

سێیەمیان : دوو حەددی لێ دەکرد ، کەچی ئەگەر یەکێك بوختانی بە کۆمەڵێك کرد تەنیا یەك حەددی لێ دەردەکرێ .

چوارەمیان : دوو حەددی بەیەکەوە کۆکردەوە ، ئەمەش نابێ .

پێنجەمیان : ئافرەتەکە شێت بوو ، شێتیش حەددی لەسەر نیە .

شەشەمیان : حەددەکە مافی پیاوەکە نەبوو بەڵکو هی دایك و باوکی بوو ، ئەگەر ئەوان داوایان بکردایە ، ئەو کات حەددەکە دەردەکرا .

- میسعەری کوڕی کیدام فەرموویەتی : چووم بۆ لای ئیمامی ئەبو حەنیفە تاکو بزانم چۆن خواپەرستی ئەکا .

بینیم لە دوای نوێژی بەیانی دەستی بە دەرس وتنەوە کرد تا نوێژی نیوەڕۆ ، دوای ئەنجام دانی نوێژ جارێکی تر دانشتەوە بۆ دەرس وتنەوە تا نوێژی عەسر ، دوای ئەنجامدانی نوێژەکە دانیشت بۆ دەرسەکەی تا نوێژی مەغریب ، دوای ئەنجام دانی نوێژەکە دانیشت بۆ فێرکردنی زانست تا نوێژی عیشا .

لە دڵی خۆم وتم : لەم پیاوە چۆن خواپەرستی پێ دەکرێ ! با لەم شەوە چاودێری بکەم تا بزانم چی ئەکا ؟

که نوێژی عیشای کرد و خەڵکەکە چوونە دەرەوە ، هەڵسا ودەستی کرد بەشەو نوێژ ، تا نوێژی بەیانی !!!
بۆ سێ ڕۆژ چاودێریم کرد ، لە دڵی خۆم وتم : شەرت بێ لە خزمەتت بم تا دەمرم !
ئیبن ئەبی موعاز فەرمووی : تا مردن لەگەڵ ئیمام ماوە و لێی جیا نەبەوە !!!

- یەحیای کوڕی نەصر فەرموویەتی : هەندێ جار ئیمامی ئەبو حەنیفە ٦٠ جار قورئانی ختم دەکرد تەنیا لە مانگی ڕەمەزان !
- ئەلقاسمی کوڕی مەعین فەرموویەتی : جارێکیان ئیمام هەڵسا بۆ شەو نوێژ ، گوێم لێ بوو چەندین جار ئەم ئایەتەی دووبارە دەکردەوە : ﴿ فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَانَا عَذَابَ السَّمُومِ ﴾ ، هەرچەند جار ئەم ئایەتەی دووبارە دەکردەوە دەگریا و فرمێسکی لە چاو ئەهاتە خوارەوە .
- ئیمامی شافعی فەرموویەتی : ئەگەر ئیش و کارێکم هەبووایە و بۆم نەکرابووایە ، ئەچوومە لای قەبری ئیمامی ئەبو حەنیفە و لەوێ دوعام دەکرد ، زۆری پێ نەدەچوو کارەکەم جێبەجێ دەکرا .
- ئیمام ٥٥ جار حەجی کردووە و نزیکەی ١٠٠ جار خوای گەورەی بینیوە لە خەوندا[17] .
- جارێکیان ئیمام پێی لەسەر پێی منالێك نا ، کە منالەکە ئازاری پێگەیشت بە ئیامامی وت : دیارە تۆ لە تۆڵەسەندنەوەی ڕۆژی قیامەت ناترسی ؟

[17] هەندێ برای خۆشەویست ڕەخنەیان لەم قسەیە هەبوو ، پێیان وتم : چۆن دەبێ مرۆڤ خوای گەورە لە خەون ببینێ ؟
منیش دەڵێم : ئیمامی نەوەوی لە ( شرح صحیح مسلم ١٥/٢٥ ) فەرموویەتی : زاناکان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی دەشێ مرۆڤ خوای گەورە لە خەون ببینێت .

که ئیمام گوێی لەم قسەیە بوو ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاو دەستی بە لەرزین کرد و کەوتە خوارەوە و لە هۆش خۆی چوو !!

- عەبدولڕەززاقی فەرموودەناس فەرموویەتی : من شوێنەواری گریانی ئیمامی ئەبو حەنیفەم بینیوە لەسەر ڕومەتی دەرکەوتبوو !!
- جارێکیان ئیمام لەگەڵ شەقیق بە ڕێگادا دەڕۆیشتن ، بینینان پیاوێك دەیەوێ خۆی لێیان بشارێتەوە ، ئیمام بانگی کرد و پێی فەرموو : بۆچی خۆت لێمان دەشاریەوە ؟

پیاوەکە وتی : من دە هەزار درهەم قەرزداری تۆمە و ماوەیکی زۆرە نەمتوانیوە بیدەمەوە ، هەر جارێك تۆ دەبینم شەرم دەکەم وخۆم دەشارمەوە !

ئیمام فەرمووی : سبحان الله ! لەبەر ئەم قەرزە تۆ وات بەسەر هات ، گەردەنت ئازا بێ لە دانەوەی ، گەردەنیشم ئازا بکە لەبەر ئەو ئازارەی پێت گەیشتووە بە هۆی ئەم قەرزەم !!!

- کاتێك ئیبن هەبیرە ئیمامی خستە بەندیخانە و بەقامچی لێیدا ، پێغەمبەر ﷺ هاتە خەونی و پێی فەرموو : لە خوای گەورە ناترسێی پیاوێکی ئومەتی من ئازار دەدەی بەبێ ئەوەی هیچ تاوانێکی کردبێ !

لەبەر ئەوە ئیبن هەبیرە ئیمامی لە بەندیخانە دەرهێنا و داوای لێبوردنی لێ کرد !!

- ئەزهەری کوڕی کەیسان فەرموویەتی : پێغەمبەرم بینی ﷺ لەخەوندا لەگەڵ ئیمامی ئەبو بەکر و عومەر خوا لێیان ڕازی بێ ، لەهەردووکیانم پرسی : دەتوانم پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ بکەم ؟

فەرموویان : بەڵێ ، بەڵام بە دەنگێکی نزم .

منیش چوومە پێش و لە پێغەمبەرم پرسی ﷺ : زانستی ئیمامی ئەبو حەنیفە چۆنە لەی پێغەمبەری خوا ؟

فەرمووی : وەکو زانستی حەزرەتی ( الخضر )ە .

- که ئیمامی شافعی هاته شاری بەغدا و سەردانی قەبری ئیمامی ئەبو حەنیفەی کرد ، نوێژی بەیانی لە مزگەوتەکەی ئەنجام دا بەڵام دەستەکانی لە تەکبیر کردن بەرز نەکردەوە و دوعای قنووتی نەخوێند .

لێیان پرسی : ئەی ئیمام : بۆچی دەستی خۆت بەرز نەکردەوە لە تەکبیر کردن و قنووتت نەخوێند ؟ ئەی ئەمە لای تۆ سوننەت نیە ؟

فەرمووی : بەڵێ لەلای من سوننەتە ، بەڵام لەبەر ڕێز و حورمەتی ئەم بەڕێزە من لە خزمەتی ئەم سوننەتە ئەنجام نادەم چونکە لای ئەبو حەنیفە سوننەت نیە !

- جارێکیان ئیمام خەونی بە پێغەمبەر ﷺ بینی وا لە مەحشەر وەستاوە لە سەر حەوزی خۆی و لەلای ڕاستی حەزرەتی ئیبراهیم علیە السلام ڕوومەتی پیرۆزی لەسەر سینگی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ داناوە ، خۆشی بینی وا لەپێش حەوزەکەیە و هەندێ لە دراوسێیانی لە نزیکی وەستاون و داوای لێ دەکەن ئاویان پێ ببەخشێ بە پەرداغێك کە لەپێش ئیمام دانرابوو ، ئیمام فەرمووی : تا پێغەمبەر ﷺ ڕێم پێ نەدا پێتان نابەخشم .

پێغەمبەریش ﷺ ڕێی پێدا ئاویان پێ ببەخشێ ، ئەویش ئاوی کەوسەری پێ بەخشین تا تێراو بوون ، ئینجا قوتابیەکانی ئیمامیش تێراو بوون ، ئاوەکەش لە شیر سپیتر و لەبەفر ساردتر و لە هەنگوین شیرینتر بوو .

- جارێکیان پیاوێك هەڵساوە لە ئەلقەی ئیمامی موقاتل و لێی پرسی : ئەمشەو لە خەونمدا بینیم مرۆڤێکی جل و بەرگ سپی لە ئاسمان هاتە خوارەوە و لەسەر درێژترین منارەی شاری بەغدا وەستاو وتی : ئایا خەڵك چی ون کردووە ؟

مانای ئەو خەونە چیە ؟

ئیمامی موقاتل فەرمووی : ئەگەر ئەم خەونەت ڕاست بێ ئەوا زاناترین کەس لەسەر ڕووی زەوی وەفات دەکات !

زۆری پێ نەچوو هەواڵی وەفات کردنی ئیمامی ئەبو حەنیفە گەیشتە ئیمامی موقاتل !!

- ئەلفەزلی کوڕی خالد فەرموویەتی : پێغەمبەرم ﷺ بینی لەخەوندا ، لێم پرسی : زانستی ئیمامی ئەبو حەنیفە چۆنە ئەی پێغەمبەری خوا ؟

فەرمووی : زانستێکە هەموو خەڵك پێویستی پێیەتی .

- مەسعودی کوڕی عەبدولڕەحمانی بەصری فەرموویەتی : لە پێش نوێژی بەیانی لە مەککەی پیرۆز و لەبەردەم کەعبەی موشەڕەف خەوتم و پێغەمبەرم ﷺ بینی لەخەوندا ، لێم پرسی : ئەی پێغەمبەری خوا : رات چیە بەرامبەر ئیمامی ئەبو حەنیفە ؟

فەرمووی : زانستەکەی وەرگرەو کاری پێ بکە ، بەراستی پیاوێکی چاکە .

- جارێکیان پیاوێك هاتە لای ئیمام و زۆر قسەی رەق و ناشیرینی پێ وت ، ئیمام دەستی بە گریان کرد و فەرمووی : خوای گەورە دەزانی من بە پێچەوانەی قسەکانی تۆمە !!

پیاوەکە دەمێك وەستا و هاتەوە سەر خۆی و دڵی نەرم بوو ، ئینجا بە ئیمامی وت داوات لێ دەکەم بە خاتری خوای گەورە ، من هەڵەم کرد ، گەردەنم ئازا بکە !

ئیمام زیاتر گریا وفەرمووی : گەردەنت ئازا بێ !!

## نموونەیك لە شیعری ئیمام

ئیمام فەرموویەتی :

إنْ يَحْسُدُونِي فَإنّي غَيْرُ لاَئِمِهِمْ
قَبْلِي مِنَ النَّاسِ أهْلَ الفَضْلِ قَدْ حَسَدُوا
فَدَامَ لِي و لَهُمْ مَا بِي و ما بِهِمْ
و مَاتَ أكْثَرُنَا غَيْظاً بِمَا يَجِدُ

واتە : ئەگەر ئەمانە ئیرەییم پێ ببەن من لۆمەیان ناکەم ، چونکە پێش من خەڵك ئیرەییان بە پیاوی گەورە بردووە ، ئەم شتەش ئەوا بەردەوام بوو و زۆربەیان بەم ئیرەیی و رق و کینەیە مردن .

## زنجیرەی زانستی ئیمامی ئەبو حەنیفە

ئیمامی ئەبو حەنیفە لە لای ئیمامی عیکرمە و عەتائی کوڕی ئەبی رەباحی خوێندووە ، ئەوانیش لەلای حەزرەتی ئیبن عەبباسیان خوێندووە ، ئەویش زانستی لە پێغەمبەر ﷺ وەرگرتووە .

هەروەها ئیمام لەلای نافعی خوێندووە ، ئەویش لەلای حەزرەتی ئیبن عومەری خوێندووە خوا لێی رازی بێ ، ئەویش زانستی لە پێغەمبەر ﷺ وەرگرتووە

هەروەها لەلای ئیمامی یەحیای کوڕی سەعیدی ئەنصاری خوێندووە ئەویش لەلای حەزرەتی ئەنەسی کوڕی مالکی خوێندووە خوا لێی رازی بێ ، ئەویش زانستی لە پێغەمبەر ﷺ وەرگرتووە .

هەروەها ئیمام لەلای سەلەمەی کوڕی کوهەیلی حەزرەمی خوێندووە ئەویش لە لای حەزرەتی ئەبو جوحەیفەی خوێندووە خوا لێی ڕازی بێ ، ئەویش زانستی لە پێغەمبەر ﷺ وەرگرتووە .

## چەند حەدیسێك كە ئیمامی ئەبو حەنیفە لە موسنەدەكەی خۆی ڕیوایەتی كردووە

١ـ ئیمامی ئەبو حەنیفە دەگێڕێتەوە لە یەحیا ئەویش لە موحەممەدی کوڕی ئیبراهیمی لەیسی ئەویش دەگێڕێتەوە لە عەلقەمەی کوڕی وەققاصی لەیسی ئەویش دەگێڕێتەوە لە ئیمامی عومەری کوڕی خەتتاب فەرموویەتی : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : **( إنَّمَا الأعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ ، و إنَّمَا لِكُلِّ امْرِىءٍ مَا نَوَى ، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إلَى اللهِ و رَسُوْلِهِ فَهِجْرَتُهُ إلَى اللهِ و رَسُوْلِهِ ، و مَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا أوِ امْرَأةٍ يَنْكِحُهَا ، فَهِجْرَتُهُ إلَى مَا هَاجَرَ إلَيْهِ )**[18] .

---

18 حديث صحيح

أخرجه احمد / رقم : ١٦٨ و البخاري / رقم : ٥٤ و مسلم / رقم : ١٩٠٧ و أبو داود / رقم : ٢٢٠١ و الترمذي / رقم : ١٦٤٧ و النسائي في السنن الكبرى / رقم :٧٨ و في المجتبى / رقم : ٧٥ و ابن ماجه / رقم : ٤٢٢٧ و ابن خزيمة / رقم : ١٤٢ و ابن حبان في صحيحه / رقم : ٣٨٩ و في الثقات / رقم : ٧٨٠٤ و البيهقي في السنن الصغرى / رقم : ١ و في السنن الكبرى / رقم ١٨١ و في شعب الإيمان / رقم : ٦٨٣٧ و في الزهد الكبير ١٣٢/٢ و الدارقطني / رقم : ١ و الحميدي / رقم : ٢٨ و أبو عوانة /رقم : ٧٤٣٨ و ابن الجارود في المنتقى / رقم ٦٤ أبو داود الطيالسي / رقم : ٣٧ و ابن المبارك في الزهد ٦٢/١ و الطحاوي في شرح معاني الآثار ٩٦/٣ و الطبراني في المعجم الأوسط / رقم : ٤٠ و البزار / رقم : ٢٥٧ و القضاعي في مسند الشهاب / رقم : ١ و ابن منده في الإيمان / رقم : ١٧ و أبو احمد الحاكم في شعار أصحاب الحديث / رقم : ٢٠ و هناد بن السري في الزهد / رقم : ٨٧١ و الديلمي في مسند الفردوس / رقم : ٤٠١ و الخطيب البغدادي في تاريخ بغداد / رقم : ١٩٧٠ و البغوي في شرح السنة / رقم : ١ و ابن شاذان في مشيخته الصغرى / رقم : ٧ و الذهبي في التذكرة ٧٧٤/٢ .

واته : بێ گومان کردەوەی مرۆڤ بەنیەت و نیازی ناو دڵ نـەبێ دانامـەزرێ و ، هـەر کەسێ بەگوێرەی نیەتەکەی پاداشتی ئەدرێتەوە و مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ ، جـا هـەر کەســێ کـۆچ کردنەکـەی بـۆ رەزامەنـدی خـوا و پێغەمبەرەکـەی بـێ ﷺ ئـەوا پاداشتەکەی لای خوا و پێغەمبەرەکەیەتی و ، هەر کەسێ کۆچ بکات بـۆ وەدەسـت هێنانی دونیا یان بۆ مارە کردنی ئافرەتێك ئەوا پاداشتەکەی لای ئەو دووانەیە[19] .

٢ـ هەروەها دەگێڕێتەوە لە سەعید ئەویش دەگێڕێتەوە لە ئیبراهیم ئەویش دەگێڕێتەوە لە حەزرەتی ئەنەس خوا لێی رازی بێ فەرموویەتی : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّداً فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ ) .

واتە هەر کەسێ بە ئەنقەست درۆ بە زمانی من بکا با شوێنی خۆی لـە دۆزەخ دابـین بکات !!

٣ـ هەروەها دەگێڕێتەوە لە ئەبو ئیـسحاق ، ئـەویش دەگێڕێتـەوە لـە ئیمـامی عـەلی فەرموویەتی : پێغەمبەر ﷺ نەفرەتی لەو کەسە کردووە کە ریبا دەخوا و ئەو کەسـەی دەرخواردی دەدات .

ئەوەش بزانە کە ئیمامی ئـەبو موحەمـەدی عەبـدوڵڵای حاریـسی کـە بـە ( أسـتاذ ) ناسراوە و لـە ساڵی ٣٤٠ی کۆچی وەفاتی کردووە ئەم موسنەدەی کۆکردۆتەوە .

## فەرموودەی زانایان دەربارەی ئیمامی ئەبو حەنیفە

- ئیمامی ئەبو عەبدیڵلای مەقدیسی فەرموویەتی : ئیمامی ئەبو حەنیفە یەکێکـە لە زانا گەورەکان و پێشەوای زانستە لە عیراق .

---

[19] بۆ زیاتر روونکردنەوەی ئەم فەرموودەیە بگەڕێوە بۆ کتێبەکەمان ( روونکردنـەوەی فـەرموودەکانی پێغەمبـەر ﷺ ١/ ٢٩ ) بە شێوەیەکی فراوانتر روونمان کردۆتەوە .

- ئیمامی موناوی فەرموویەتی : ئیمامی بالاً دەست و پێشەوای زانایانی عیراق، ناوبانگی دەکردووە بە تێگەیشتن و ڕۆیشتن لەسەر چاکترین ڕێگا ، ناوی لێ نرا بوو کۆڵەکە ئەوەندە بەشەو بوەستێ بۆ شەو نوێژ و خواپەرستی ، ئیمام بەردەوام بیری دەکردەوە و زۆر کەم قسەی دەکرد .
- ئیمامی ئەبو یوسف فەرموویەتی : ئیمام زۆر تووڕە دەبوو کاتێك حەرام ئەنجام دەدرا و ، زۆر ئەترسا لەوەی شتێك بڵێ لە ئاینی خوا بەبێ زانست ، بەردەوام لە بیرکردنەوەدا بوو لەگەڵ ئەوەی زانستێکی زۆری هەبوو ، هەروەها زۆر کەم قسەی دەکرد و زۆر پارە و سامانی دەبەخشی لە پێناو خوای گەورە و ناوی کەسی نەدەهێنا بەچاکە نەبێ .
- ئەلنەزری کوڕی سەحل فەرموویەتی : خەڵك هەموو بێ ئاگا بوون لە ( فقە ) تا ئەبو حەنیفە بەئاگای هێنان .
- ئیمامی شافعی فەرموویەتی : ئەگەر ئیمامی ئەبو حەنیفە نەبووایە خەڵك نەیدەزانی ( فقە ) چیە ؟
- ئیمامی ئیبنولموبارەك فەرموویەتی : هەرگیز گوێم لە ئیمامی ئەبو حەنیفە نەبووە غەیبەتی کەس بکات ، ئەگەر کەسێکیش کاری پێ بووایە ، بەهەموو توانای خۆی بۆی ئەنجام دەدا ...
- ئیمامی مالك فەرموویەتی : ئەبو حەنیفە ئەوەندە زیرەك و لێهاتوو بوو ، ئەگەر کۆڵەکەیەك لە بەرد دروست کرابووایە وبیویستبایە لە پێش چاوت بیکا بە زێڕ ... لەیتوانی !!
- ئیمامی یەحیای کوڕی مەعین فەرموویەتی : چاکترین تێگەیشان بۆ ئاینی خوا تێگەیشتنی ئەبو حەنیفەیە .

- جەعفەری کوڕی رەبیع فەرموویەتی : پێنج ساڵ لە خزمەت ئەبو حەنیفە دانیشتم ، بینیم لە هەموو کەسێك کەمتر قسە دەکات و ، ئەگەر پرسیاری لێ کرابووایە ، وەکو باران زانستی بۆ دەرژاندی .
- ئیمامی ئیبنولموبارەك فەرموویەتی : بە ئیمامی سوفیانی سەوریم وت : ئەی باوکی عەبدوللا : ئیمامی ئەبو حەنیفە زۆر لە غەیبەت دوور دەکەوێتەوە ، تاوەکو ئێستا نەمدیوە غەیبەتی کەس بکات .

ئیمامی سەوری فەرمووی : ئەبو حەنیفە زۆر لەوە ئاقڵترە کردەوە چاکەکانی خۆی بە فیڕۆ بدات .

- ئەسەدی کوڕی عەمر فەرموویەتی : ئەوەی زانراوە لە ئیمامی ئەبو حەنیفە کە ٤٠ ساڵی تەواو بەدەست نوێژی عیشا نوێژی بەیانی کردووە و ، هەموو قورئانی لە یەك رەکعەتدا خوێندووە لە شەونوێژ ، ٧٠٠٠ جار قورئانی خەتم کرد تەنیا لەو شوێنەی کە تیایدا وەفاتی کرد !
- ئیمامی سوفیانی کوڕی عویەینە فەرموویەتی : تاوەکو ئێستا مرۆڤێکی وەکو ئیمامی ئەبو حەنیفەم نەدیوە .
- ئەبو یەحیای حیممانی فەرموویەتی : تا ئێستا مرۆڤێکی چاکی وەکو ئەبو حەنیفەم نەبینیوە .
- ئیمامی ئەبو بەکری کوڕی عەییاش فەرموویەتی : ئەبو حەنیفە چاکترین خەڵکی سەردەمی خۆی بوو .
- قازی شەریك فەرموویەتی : ئەبو حەنیفە مرۆڤێکی بێ دەنگ و بەردەوام لە بیرکردنەوەدا بوو ، پیاوێکی تێگەیشتوو بوو .
- ئەلحەسەنی کوڕی صالح فەرموویەتی : هیچ کەسێك وەکو ئیمامی ئەبو حەنیفە نەبوو لە تەقوا و لەخواترسان .

- ئبن فوزەیل فەرموویەتی : ئەبو حەنیفە ناسراو بوو بە فەزل و گەورەیی و کەم قسە کردن .
- قەیسی کوڕی رەبیع فەرموویەتی : ئەبو حەنیفە مرۆڤێکی لەخواترس بوو ، بەردەوام چاکەی لەگەڵ براکانی دەکرد .
- موحەممەدی کوڕی جابر فەرموویەتی : ئەبو حەنیفە قسەی کەم دەکرد و کەم پێدەکەنی و زۆر بیری دەکردەوە ، کاتێک ئەتبینی دەتووت تازە بەڵای بەسەردا هاتووە .
- ئیمامی ئەبو نوعەیم فەرموویەتی : سوێند بەخوا ئیمام پیاوێکی زۆر ئەمین بوو .
- ئیمامی وەکیعی کوڕی جەڕاح فەرموویەتی : کەس وەکو ئەبو حەنیفە نیە لە تێگەیشتن ، هەروەها زۆر ئەمین بوو و بەردەوام ترسی خوای لەدڵ بوو ، هەروەها خاوەن هەیبەتێکی زۆر گەورە بوو ، خوا لێی رازی بێ ، یەکێك بوو لە پیاو چاکان .
- ئەلمسعودی فەرموویەتی : تاوەکو ئێستا نەمبینیوە کەس لە ئیمام ئەمینتر بێ ، کاتێ وەفاتی کرد نزیکەی ٥٠٠٠٠ دیناری ئەمانەتی لا بوو ، دیتارێکی لێ ون نەبوو .
- میسعەری کوڕی کیدام فەرموویەتی : سوێند بەخوا ئیمامی ئەبو حەنیفە پیاوێکی تێگەیشتوو بوو .
- مالکی کوڕی میغوەل فەرموویەتی : ئیمامی ئەو حەنیفە زۆر تێگەیشتوو بوو لە ( فقه ) و ، لە ( قیاس )یش کەس وەکو ئەو نەبوو .
- ئیمامی ئەبو نوعەیم فەرموویەتی : کاتێك ئیمام وەفاتی کرد ، گوێم لە عەلی کوڕی صالح بوو فەرمووی : ئەمڕۆ موفتی عیراق رۆیشت ... ئەمڕۆ تێگەیشتووترین خەڵکی کووفە رۆیشت ...

- ئـەبو عەبـدولڕەحمانی مـوقری فەرموویـەتی : ئـەبو حەنیفـە زانایـەکی تێگەیشتووە .
- ئیمامی سەعیدی کوڕی ئەبی عەروبە فەرموویەتی : ئەبو حەنیفە زانای عێراق بوو .
- ئەحمەدی کوڕی حەربی نەیسابووری فەرموویەتی : چـۆن خەلیفـە گـەورەترە لە خەڵکی سادە ، ئاوا ئەبو حەنیفە لە زانای تر گەورەتر بوو .
- ئیمامی ئەبو یوسف فەرموویەتی : ئەگەر مەسەلەیەك تووشـی ئیمـام ببوایـە ، ئەیفەرموو : هیچ فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ یـان وتەیـەکی صـەحابەکانتان لەبەرە لەم مەسەلەیە ؟

ئەگەر هەبووایە و پێمان بووتبایە ، یەکسـەر کاری پێ دەکـرد ، ئەگـەر نەبووایـە ئیجتیهادی دەکرد .

- عەلی کوڕی عاصم فەرموویەتی : ئەگەر ئەقڵی ئەبو حەنیفە لە لایەك دابنـرێ و ئەقڵی نیوەی خەڵکی سەر رووی زەوی لـە لایەکی تـر دابنـرێ ، هێشتان ئەقڵی ئەبو حەنیفە زیاترە !!
- حوجری کوڕی عەبدولجەببار فەرموویەتی : تاوەکو ئێـستا خـەڵك یـەکێکی نەدیوە وەکو ئەبو حەنیفە لە مەجلیس خۆشی و چاکە کردن لـەگەڵ هـاوڕێی خۆی .
- سەهلی کوڕی موزاحم فەرموویەتی : ئەبو حەنیفە زۆر چاکەکار بوو لـەگـەڵ هاوڕێیانی .
- یەحیای کوڕی سەعید فەرموویەتی : هەر کە ئیمـامی ئـەبو حەنیفـەم لـەبینی دەمزانی پیاوێکی لەخواترسە .

- جارێکیان ئیمام چووە لای خەلیفە ئەبو جەعفەری مەنسوور ، هەر کە عیسای کوڕی موسا چاوی بە ئیمام کەوت وتی : ئەمە زانای هەموو دونیایە .
- کاتێك ئیمامی ئەعمەش ویستی بچێ بۆ حەج کردن ، فەرمووی : با بچین بۆ لای ئیمامی ئەبو حەنیفە تا کردەوەکانی حەجمان بۆ بنووسێ .
- حەممادی کوڕی زەید فەرموویەتی : ویستم حەج بکەم ، چووم بۆ لای حەزرەتی ئەیوبی سوختیانی تا خواحافیزی لێ بکەم ، حەزرەتی ئەیوب پێی فەرمووم : پێم گەیشتووە کە زانای شاری کوفە ئەبو حەنیفە دەیەوێ حەج بکات ، ئەگەر بینینت سەلامی منی پێ بگەیەنە .
- یەحیای کوڕی زەکەریا فەرموویەتی : هەر کەسێ لەگەڵ ئیمامی ئەبو حەنیفە دانیشتبێ و گوێی لە قسەکانی بووبێ ئەزانی قەدری ئەم بەڕێزە چەندە ؟
- موحەممەدی کوڕی عیسای تەباع فەرموویەتی : گوێم لە رەوحی کوڕی عوبادە بوو فەرمووی : من لەلای ئیمامی ئیبن جورەیج دانیشتبووم لە سالی ١٥٠ ی کۆچی ، لەم کاتە هەواڵی مردنی ئیمامی ئەبو حەنیفەی پێ گەیشت، ئیمامی ئیبن جورەیج فەرمووی : إنا لله و إنا إلیه راجعون ، چ زانستێك لەمڕۆ رۆیی ؟!
- ئیمامی خەتیبی بەغدادی فەرموویەتی : پێشەوای زانایانی عیراق ئەبو حەنیفەیە .
- ئەبو عوسمانی توورسی فەرموویەتی : گوێم لە ئیمامی ئیبنولموبارەك بوو دەیفەرموو : جارێکیان سەفەرێکم کرد بۆ شام و چووم خزمەت ئیمامی ئەوزاعی لە شاری بەیروت ، کە منی بینی پێی فەرمووم : عەبدوللا : ئەو بیدعەچیە کێیە کە لە شای کوفە پەیدا بووە و ناوی ئەبو حەنیفەیە ؟!!

منیش بێ دەنگ بووم ، کە گەڕامەوە ماڵەوە هەڵسام چەند مەسەلەیەکی ئیمامی ئەبو حەنیفەم هێنا و بە ئیمامی ئەوزاعیم نیشاندا ، کە خوێندیەوە فەرمووی :
عەبدوڵلا : ئەم وەڵامانە هی کێن ؟
وتم : هی زانایەکە لە عیراق .
فەرمووی : ئەم پیاوە زانایەکی بەرزە ، برۆ لای و زانستی لێ وەربگرە .
لەم کاتە وتم : ئەمە ئەو ئەبو حەنیفەیەیە کە تۆ زەمت دەکرد .

- مەعمەر فەرموویەتی : هیچ کەسێ وەکو ئەبو حەنیفە نیە لە تێگەیشتن .
- ئەبو جەعفەری رازی فەرموویەتی : تاوەکو ئێستا کەسی وەکو ئەبو حەنیفەم نەدیوە لە زانستی ( فقه ) و لەخواترسی .
- ئیمامی فوزەیلی کوڕی عیاز فەرموویەتی : ئەبو حەنیفە پیاوێکی تێگەیشتووی لەخواترسی بەخشێنەر بوو ، زۆر چاکەی لەگەڵ هاوڕێکانی دەکرد و ، زۆر سەبری ئەگرت لەسەر فێرکردنی زانست و ، بەردەوام بێ دەنگ دەبوو و کاتێ مەسەلەیەکی حەڵاڵ و حەرام دەهاتە پێشی قسەی زۆر جوانی دەربارەی دەکرد .
- ئەبو بەکری کوڕی عەیاش فەرموویەتی : جارێکیان عەبدوڵلای کوڕی ئیدریس دانیشتبوو لە جێگایەك ، ئیمامی ئەبو حەنیفە هاتە لای ، بینیم عەبدوڵلا هەڵساوە و لەباوەشی خۆی نا ، منیش زۆر تووڕە بووم !!

دوای ماوەیەك ئەبو حەنیفە هەڵسا و رۆیشت ، منیش چوومە لای عەبدوڵلا و پێم وت : ئەوە چیت کرد ؟! بۆچی بۆ ئەم پیاوە هەڵسای ؟!!
فەرمووی : ئەمە پیاوێکە خاوەن زانستێکی زۆرە ، ئەگەر بۆ زانستەکەی هەڵنەستم بۆ تەمەنەکەی هەڵدەستم ، ئەگەر بۆ تەمەنەکەشی هەڵنەستم بۆ تێگەیشتنەکەی هەڵدەستم !
منیش بێ دەنگ بووم و زانیم لەسەر هەقە .

- ئیبن داوود فەرموویەتی : ئەگەر دەتەوێ وردترین مەسەلە لە دینی خوا بزانی، خۆت بگەیەنە فیقهی ئیمامی ئەبو حەنیفە .
- شەددادی کوڕی حەکیم فەرموویەتی : تاوەکو ئێستا مرۆڤێکی زاناترم لە ئەبو حەنیفە نەدیوە .
- مەککی کوڕی ئیبراهیم فەرموویەتی : ئەبو حەنیفە زاناترین کەس بوو لە سەردەمی خۆی .
- یەحیای کوڕی سەعیدی قەتتانی فەرموودەناس فەرموویەتی : بۆچوونی ئیمامی ئەبو حەنیفە چاکترین بۆچوونە .
- ئیمامی یەزیدی کوڕی زورەیع فەرموویەتی : فەتواکانی ئەبو حەنیفە لە هەموو شوێنێك بلاَوبۆتەوە .
- ئیبراهیمی کوڕی عیکرمەی مەخزوومی فەرموویەتی : نەمزانیوە کەس لە ئیمامی ئەبو حەنیفە شارەزاتر و لەخواترستر بێ .
- حەسەنی کوڕی موحەممەدی لەیسی فەرموویەتی : جارێکیان هاتمە شاری کووفە ، پرسیارم لە خەڵکەکەی کرد : کێ لەهەموو کەسێك لەخواترسترە لەم شارە ؟

وتیان : ئیمامی ئەبو حەنیفە !!

- یەحیای کوڕی ئەیووبی زاهد فەرموویەتی : خەو نەدەچووە چاوی ئیمامی ئەبو حەنیفە لەبەر خواپەرستی .
- ئەبو عاصمی نەبیلی فەرموودەناس فەرموویەتی : ئیمام ناوی لێ نرابوو کۆڵەکە نەوەندە بوەستێ لە شەونوێژدا .
- حەفصی کوڕی عەبدولڕەحمان فەرموویەتی : ئیمام بۆ ماوەی سی ساڵ هەموو قورئانی لەیەك ڕەکعەتی شەونوێژ خەتم دەکرد .

- ئەبوجوەیریە فەرموویەتی : لەگەڵ ئیمامی حەممادی کوڕی ئەبی سولەیمان و موحاریبی کوڕی دیسار و عەلقەمەی کوڕی مەرسەد و عەونی کوڕی عەبدوڵلا گەڕاوم ، کەسم نەدیوە شەوی خۆی زیندوو بکاتەوە بە خواپەرستی وەکو ئیمامی ئەبو حەنیفە ، چەند مانگێك لەگەڵی بووم ، نەمدیت تەنیشتی خۆی لەزەوی بدا و بخەوێ !!
- قەیسی کوڕی رەبیع فەرموویەتی : ئەبو حەنیفە مرۆڤێکی لەخواترسی تێگەیشتوو بوو ، زۆر خێر و چاکەی دەکرد بەتایبەتی لەگەڵ هاوڕێکانی ، بەراستی پیاوێك بوو لە ئاقڵ و ژیرەکان ، بازرگانی دەکرد و هەموو قازانجی تا کۆتایی ساڵ هەڵدەگرت ، ئینجا ئەیبەخشی بە فەرموودەناسان و پیاو چاکان و لەخواترسان و ئەیفەرموو : ئەمە رزقی خوای گەورەیە پێتان بەخشراوە بەهۆی منەوە ، جا تەنیا سوپاسی خوای گەورە بکەن .
- ئەلحەسەنی کوڕی زیاد فەرموویەتی : جارێکیان ئیمام لە مەجلیسێك دانیشتبوو ، بینی یەکێك لە هاوڕێکانی جلێکی خراپی لەبەرە ، کە خەڵکەکە هەڵسان لە مەجلیسەکە ئیمام فەرمووی : فلانی کوڕی فلان دانیشە هەندێ کارم پێتە ، کە بەتەنیایی مانەوە ، ئیمام بە هاوڕێکەی فەرموو : ئەم بەڕە هەڵدەوە و چی لە ژێر بوو بۆ تۆیە و حاڵی خۆتی پێ چاك بکە ، کە پیاوەکە بەڕەکەی هەڵداوە بینی ۱۰۰۰ درهەمی لە ژێرە ، وتی : قوربان : من حاڵم زۆر باشە و پێویستیم بە پارە نیە !!

ئیمام فەرمووی : ئەی فەرموودەی پێغەمبەرت ﷺ پێ نەگەیشتووە کە دەفەرمووێ : ( إنَّ اللهَ يُحِبُّ أنْ يرى أثرُ نِعْمَتِهِ عَلَى عَبْدِهِ )[20] ، پێوستە لەسەرت حاڵت چاك بکەی تا هاوڕێت غەمبار نەبێ !!

---

[20] واتە : خوا گەورە دەیەوێ شوێنەواری نیعمەتی لەسەر بەندەی خۆی دیار کەوێ .

- ئەبولفیدا فەرموویەتی : ئەبو حەنیفە زانایەکی دونیانەویستی لەخواترس بوو .
- خاریجەی کوڕی موصعەب فەرموویەتی : گەیشتمە خزمەت ١٠٠٠ زانا ، سێ لەوانە زۆر ئاقڵ و تێگەیشتوو بوون : یەکێك لەو سیانە ئەبو حنەیفە بوو .
- یەزیدی کوڕی هارون فەرموویەتی : کەسم نەدیوە وەکو ئەبو حەنیفە لە ئەقڵ گەورەیی و تێگەیشتن و لەخواترسی .
- ئەلحسەنی کوڕی عومارە فەرموویەتی : سوێند بەخوا کەسمان نەدیوە وەکو ئەبو حەنیفە قسە و راو بۆچوونی زۆر چاکی هەبێ .
- ئەبو وەهبی عابید فەرموویەتی : ئەو کەسەی ئەبو حەنیفە بە پیاوێکی چاك نەژمێرێ ... کەم ئەقڵە !
- ئیمامی ئیبنولعیماد فەرموویەتی : ئەبو حەنیفە یەکێك بوو لە زیرەکەکان و ، تێگەیشتن و خواپەرستی کۆکردبۆوە لەگەڵ بەخشین و کردەوەی چاك .
- ئیمامی زەهەبی فەرموویەتی : ئەبو حەنیفە زانایەکی گەورەی خواپەرستی لەخواترس بوو ، بەهیچ شتێکی کاربەدستانی وەرنەدەگرت ، بەڵکو بۆ خۆی کاری دەکرد .

# هەندێ لە فەرموودەکانی ئیمامی ئەبو حەنیفە

ئیمام فەرموویەتی :

- هەر شتێ لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتبێ لەسەر سەرو لەسەر چاوان دایدەنێین و، هەر شتێ لە صەحابەکان هاتبێ خوا لێیان رازی بێ بەگوێرەی توانامان و کاممان پێ پەسەندتر بوو هەڵیدەبژێرین وکاری پێ دەکەین ، جگە لە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی هەر رایەك لەهەر زانایەك هاتبێ ، ئەوا ئێمەش وەکو ئەوان پیاوین و ئیجتیهاد دەکەین و لەسەرمان نیە لاسایی ئەوان بکەینەوە .
- تاوانباری وەکو ئێمە نابێ داوای بەهەشت بکا ، دەبێ داوای لێ خۆش بوون بکات !
- پەنجا ساڵ لەگەڵ خەڵك دانیشتم ، کەسم نەدی لە گوناهێکم خۆش بێ .
- هیچ شتێك کەمتر نیە لەو دونیایە : لە شەرع زانێکی لەخواترس .
- هیچ زانستێك باشتر وبەسوودتر نیە لە ( فقه ) .
- لەدوای هەموو نوێژەکان دوعا بۆ ئەو کەسە دەکەم کە زانستی فێر کردووم، هەرچەند ئەو زانستە کەمیش بوویێت .
- هەر کەسێ وابزانێ هیچی تر پێویستی بە داواکردنی زانست نیە ، با لەسەر نەزانی خۆی بگری .
- ئەو قسانەی ئێمە دەیکەین راو بۆچوونمانە ، ئەگەر یەکێکی تر رایەکی چاکتری هەبوو ، با خەڵك دوای ئەو بکەوێ باشترە .
- کاتێك ئیمام دەچوو بۆ لای قەبری پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو :

يَا أكْرَمَ الخَلْقِ يَا كَنْزَ الوَرَى

جُدْ لِي بِجُودِكَ و ارْضِنِي بِرِضَاكَ

أنَا طَامِعٌ بِالجُوْدِ مِنكَ لَمْ يَكُنْ

لأبي حَنِيْفَةَ في الأَنَامِ سِوَاكَ

واته : ئەی پێغەمبەری خوا : ئەی باشترین دروست کراوی خوا : ڕەزامەندی خۆتم پێ ببەخشە ، چونکە من زۆر داوای بەخشین لەتۆ دەکەم ، تەنیا تۆی پشت و پەنای ئەبو حەنیفە .

# وەفات کردنی ئیمام

ئیمام لە دوانزەی مانگی ڕەجەبی ساڵی ١٥٠ی کۆچی لە شاری بەغدا وەفاتی کرد لە تەمەنی ٧٠ ساڵی .

ئەلحسەنی کوڕی عومارە و ئەبو ڕەجالی هەرەوی شۆردیان ، لە کاتی شۆردنی ئەلحسەن ئەیفەرموو : ڕەحمەتی خوات لێ بێ : دە ساڵە بەرۆژووی و ٤٠ ساڵە شەونوێژ دەکەی !

کە وەفاتی کرد ئیمامی شوعبە فەرمووی : إنّا لله و إنّا إليهِ راجعُونْ ، نووری زانست لە شاری کوفە کوژایەوە ، جارێکی تر وێنەی نابینینەوە .

شەش جار نوێژی لەسەر کرا لەبەر قەڵەباڵغی و زۆری خەڵك ، لە ڕۆژی دووەم خەلیفە ئەبو جەعفەری مەنسوور نوێژی لەسەر کرد ، ژمارەی خەڵکەکە پەنجا هەزار کەس بوو .

ئیمامی خەتیبی بەغدادی فەرمویەتی : قەبرەکەی لە ڕۆژهەڵاتی شاری بەغدایە لە گۆڕستانی خەیزەران .

صەدەقەی موغایری فەرمووی : کاتێك ئیمام نێژرا گوێمان لە دەنگێك بوو لەیوت :

ذَهَبَ الفِقْهُ فَلاَ فِقْهَ لَكُمْ

فَاتَّقُوا اللهَ و كُونُوا خَلَفَا

مَاتَ النُعْمَانُ فَمَنْ ذَا الذِي

يَحْيِي اللَّيْلَ إذَا مَا سَجَفَا

واتە : ئەمڕۆ ( فقە ) مرد و لاتان نەما ، جا لەخوا بترسن و ببن بە هەڵگری لە دوای ئەو ، نوعمان وا وەفاتی کرد ، کێ لەدوای ئەو شەوان زیندوو دەکاتەوە بەخواپەرستی ؟

ئینجا ئیمامی ئیبنولموبارەك لەسەر قەبرەکەی وەستا و فەرمووی : رەحمەتی خوات لێ بێ ، بەراستی کەسی وەکو خۆت لەدوای خۆت جێ نەهێشتووە .

ئینجا زۆر بە کوڵی گریا و داوای لێ خۆش بوونی بۆ کرد .

ئیمامی ئیبن خەڵلیکان فەرموویەتی : قەبرەکەی ناسراوە و خەڵك بەردەوام سەردانی دەکات .

لە دوای ئەمە لە ساڵی ٤٥٩ی کۆچی ئەبو سەعدی خەوارزمی کە کاربەدەستێکی باڵا بوو لە لای سوڵتان مەلیك شاهی سەلجوقی قوتابخانەیەکی گەورەی دامەزراند لەسەر مەزهەبی ئیمامی ئەبو حەنیفە لە نزیك قەبرەکەی ، لەبەر ئەوە ئەلبەیازی فەرموی :

اَلَمْ تَرَ اَنَّ العِلْمَ كَانَ مُبَدَّدَاً

فَجَمَعَهُ هَذَا المُغَيَّبُ فِي اللحْدِ

كذلِكَ كَانتِ الأرْضُ مِيْتَةً

فَأنْشَرَهَا فِعْلُ العَمِيْدِ ابِي سَعْدِ

واتە : نەتدیوە زانست پەرت بڵاوبوو تا ئەو کەسەی لەم قەبرە کۆی کردەوە ، هەر ئاواش زەوی دەورروبەری ئەم قەبرە مردوو بوو ، کاربەدەستی بە توانا ئەبو سەعد زیندووی کردەوە بە دروست کردنی ئەم قوتابخانەیە .

رەحمەتی خوا بڕژێ بەسەر گیانی پاکت ئەی ئیمامی بەتوانا
بەرەکەتی خوا لەبەرەکەت دابگرێ ئەی لەخواترسی خواناس ...
خـوای گـەورە پاداشـت بداتـەوە لەسـەر کـردەوە چـاکەکان و زانـستە
گەورەکەت ... ئەی گەورەی زانایان ...

## ناوی ئیمام

ناوی مالکی کوڕی ئەنەسی کوڕی مالکی کوڕی ئەبی عامری کوڕی عەمری کوڕی حاریسی کوڕی غەیمانی کوڕی جوسەیلی کوڕی عومەری ئەصبەحی مەدەنیە ، کونیەکەشی ئەبو عەبدیللایە ، دایکیشی ناوی : ئەلغالیەی کچی شەریکی کوڕی عەبدولڕەحانە .

## لەدایك بوونی

ئیمام لە ساڵی ۹۳ی کۆچی لە شاری مەدینەی پیرۆز لەدایك بووە .

## داواکردنی زانست

ئیمامی مالك فەرموویەتی : لە بچووکیم بەدایکی خۆم وت : دایە گیان : ڕێم پێ دەدەی بچم بۆ داواکردنی زانست ؟
دایکم وتی : وەرە با جل و بەرگی داواکاری زانستت بکەمە بەر .
ئینجا هەندێ جل و بەرگی پێ بەخشیم و پێی وتم : بڕۆ بۆ لای ڕەبیعە ، یەکەمین جار دەبێ فێری ئەدەب و ڕەوشت بی ئینجا فێری داوای زانست بکە .
منیش فەرمانەکەم جێبەجێ کرد و چوومە خزمەت ئیمامی ڕەبیعە و دەستم کرد بە داواکردنی زانست .

## شێوەی ئیمامی مالك

ئیمامی ئیبنولعیماد فەرموویەتی : ئیمامی مالك مرۆڤێكی درێـژی بـەهێزی بـەتوانای سپی بوو و رەنگی چاوەكانی شین بوو و بەردەوام جل و بەرگی عـەرەبی ئەكردەبـەر و ، زۆر كەم پێدەكەنی و خاوەن هەیبەتێكی زۆر بوو و باشترین كەس بوو بـۆ مـاڵ و منداڵەكەی و ، لەسەر ئەنگوستیلەكەی نوسراو بوو : ( حسبنا الله و نعم الوكيل ) .

## ئایا هیچ فەرموودە هاتووە دەربارەی ئیمامی مالك ؟

عەبدولرەززاقی فەرموودەناس وئیمامی سوفیانی كـوڕی عویەینـە دەفـەرموون : لـەو فەرموودەیەی كە لە پێغەمبەر ﷺ هاتووە كە تیایدا دەفەرموێ : ( يُوْشِكُ النَّاسُ أنْ يَضرِبُوا أكْبَادَ الإبْلِ فِي طَلَبِ العلمِ فَلا يَجِدُوْنَ عَالِمَاً اعْلَمَ مِنْ عَالِمِ المَدِيْنَةِ )[21] ، ئێمە دەڵێین دەربارەی ئیمامی مالك هاتووە .

---

[21] اخرجه الحاكم في المستدرك ١٦٨/١ و صححه على شرط مسلم .

# مامۆستاکانی ئیمام

ئیمامی مالك لـه ژمارەیکی یەکجار زۆر زانا و ئیمام زانستی وەرگرتـووە ، ئەمانـەش ناوی هەندێکیانن :

- ئیسحاقی کوڕی عەبدوللای کوڕی ئەبی تەلحە .
- ئیسماعیلی کوڕی ئەبی حەکیم .
- ئیمامی جەعفەری صادق .
- سەوری کوڕی یەزیدی دیلی .
- حومەیدی تەویلی فەرموودەناس .
- داوودی کوڕی حوصەین .
- داوودی کوڕی عەبدوللا .
- ئیمامی رەبیعەتولرەئی .
- زیادی کوڕی ئەبی زیاد .
- زیادی کوڕی سەعد .
- زیادی کوڕی رەباح .
- زەیدی کوڕی ئەسلەم .
- زەیدی کوڕی ئەبی ئونەیسە .
- سالم ئەبولنەزر .
- سەعدی کوڕی ئەبی ئیسحاق .
- سەعیدی کوڕی عەمری کوڕی شورەحبیل .
- سومەی خزمەتکاری عەبدولرەحمان .
- سەلەمەی کوڕی دینار .
- سوهەیلی کوڕی ئەبی صالح .

- سەلەمەی کوڕی صەفوانی زورقی .
- سەعدی کوڕی ئیسحاق .
- شەریکی کوڕی ئەبی نەمر.
- صالحی کوڕی کەیسان .
- صەفوانی کوڕی سولەیم .
- تەلحەی کوڕی عەبدولمەلیکی ئەیلی .
- عامری کوڕی عەبدوللای کوڕی زوبەیر .
- عەبدوللای کوڕی دینار .
- ئیمامی عەتائی خوڕاسانی .
- ئیمامی عەلقەمە .
- ئیمامی زوهری .
- موسلیمی کوڕی عومارە .
- ئەلعەلائی کوڕی عەبدولڕەحمان .
- موحەممەدی کوڕی یەحیا .
- ئەلفوزەیلی کوڕی یەحیا .
- قوتنی کوڕی وەهب .
- کەسیری کوڕی زەیدی ئەسلەمی .

زۆر زانای تریش .

# قوتابیەکانی ئیمام

زۆر قوتابی لەسەر دەستی ئیمام پەروەردە بوون و زانای گەورە و بەتوانایان لێ دەرچوو ، لەوانە :

- ئیمامی شافعی .
- ئیبراهیمی کوڕی تەهمان .
- ئیبراهیمی کوڕی عەبدوللا .
- ئیبراهیمی کوڕی عومەر .
- ئەبو حوزافەی سەهمی : ئەم بەڕێزە دوایین قوتابی بوو فەرموودەی لێ بگێڕێتەوە .
- ئیمام ئەبو موصعەبی زوهری .
- ئیمامی ئەبو ئیسحاقی فەزاری .
- ئادەمی کوڕی ئەبی ئیاسی عەسقەلانی .
- ئیسحاقی کوڕی سولەیمانی رازی .
- ئەبو نوعەیمی توجەیبی .
- ئیسحاقی کوڕی موحەممەدی فەرەوی مەدەنی : کە مامۆستای ئیمامی بوخاریە .
- ئیسحاقی کوڕی یوسفی ئەزرەقی فەرموودەناس .
- ئەسەدی کوڕی فورات .
- ئەسەدی کوڕی موسای ئەمەوی فەرموودەناس : بەئەسەدی سونە ناسراوە .
- ئیسماعیلی کوڕی ئەبی حامد .
- ئیسماعیلی کوڕی ئەبی ئوەیسی مەدەنی .
- ئیمامی ئەییوبی سوختیانی .

- بەشیری کوڕی حەکەمی فەرمووردەناس .
- ئیمامی حەممادی کوڕی زەید .
- ئیمامی حەممادی کوڕی سەلەمە .
- سەعیدی کوڕی حەکەمی فەرمووردەناس : کە مامۆستای ئیمامی بوخاریە .
- ئیمامی سەعیدی کوڕی مەنصور .
- ئیمامی سوفیانی سەوری .
- ئیمامی سوفیانی کوڕی عویەینە .
- شوعبەی کوڕی حەججاجی فەرمووردەناسی گەورە .
- ئیمامی ئەبو بیستامی عەتەکی .
- ئیمامی ئەبو عاصمی نەبیل : کە مامۆستای ئیمامی بوخاریە .
- ئیمامی قەعنەبی .
- ئیمامی ئەوزاعی : کە خاوەن مەزهەبێکی سەربەخۆ بوو و زانایەکی موجتەهید بوو .
- عەبدولرەحمانی کوڕی مەهدی .
- عەبدولرەززاقی صەنعانی فەرمووردەناس .
- ئیمامی ئیبن جورەیج .
- ئەلفەزلی کوڕی دوکەینی فەرمووردەناس .
- ئیمامی نافعی کوڕی ئەبی نوعەیمی مەدەنی : کە یەکێکە لە قورئان خوێنە بەناوبانگەکان ( القرّاء السبعة ) .
- ئیمامی وەکیع .
- یەحیای کوڕی سەعیدی قەتتانی فەرمووردەناس .

زۆر قوتابی تریش کە ژمارەیان نزیکەی ١٤٠٠ قوتابیە ، هەروەکو ئیمامی زەهەبی وا دەفەرمووێ .

# زیرەکی ئیمام

- ئیمـامی مالـك فەرمووویـەتی : جارێکیـان ئیمـامی زوهـری چـل و هەنـدێ فەرموودەی بۆ خوێندمەوە ، ئینجا پێی وتم : ئەم فەرموودانەم بۆ بڵێوە ؟.

منیش چل فەرموودەم بۆ دووبارە کردەوە و ئەوانی ترم لەبیر چوو !!

- هەروەها فەرمووویـەتی : مـن دەچـوومە خزمـەت ئیمـامی سـەعیدی کـوڕی موسـەییەب و عوروە و ئەلقاسم و ئەبو ئوسـامە و حومەیـد و سـالم ، لەهـەر یەکێکیان زیاتر لە ٥٠ فەرموودەم وەردەگرت و هەمووم لەبەر دەکـرد بـێ ئەوەی فەرموودەکانیان تێکەڵ یەکو بکەم !! و تا ئێستا گوێم لەهەر قسەیەك بووبێ لەبیرم نەچۆتەوە !!!

- عەبدوڵلای کوڕی ئیدریسی ئـەودی فەرمووویـەتی : مـن نەمـدەزانی وشـەی ( دجّال ) کۆیەکەی ( دجاجلة )یـە تـاوەکو گـوێم لـە ئیمـامی مالـك بـوو دەربارەی یەکێك ئەدوا و دەیفەرموو : ( إنَّما هُـو دَجَّـالٌ مـنَ الدَّجَاجِلـةِ ) ، واتە : ئەم مرۆڤە درۆزنێکە لە درۆزنە گەورەکان[٢٢] .

---

[22] ئەمەش بەڵگەیە لەسەر شارەزایی ئیمام لە زمانی عەرەبی .

# ئەحوال و کەڕاماتی ئیمام

- ئەبو سەلەمەی خوزاعی فەرموویەتی : کاتێك ئیمام دەیویست فەرموودە بگێڕێتەوە ، دەست نوێژێکی جوانی دەشوشت و جوانترین جل وبەرگی ئەکردەبەر و ردێنی خۆی شانە دەکرد و ئەیفەرموو : دەبێ فەرموودەکانی پێغەمبەر بە گەورە بزانرێ و ڕێزی لێ بگیرێ .
- خەلەفی کوڕی عومەر فەرموویەتی : جارێکیان لە لای ئیمامی مالك دانیشتبووم ، بینیم ئیبن کەسیر کە قورئان خوێنێکی بەناوبانگ بوو هاتە لای ئیمام و پەڕێکی دا دەستی ، کە ئیمام خوێندیەوە لەژێر بەڕەکەی دانا ، کاتێك ئیبن کەسیر هەڵسا ویستم منیش بڕۆم ، بەڵام ئیمام فەرمووی : لەی خەلەف دانیشە .

ئینجا پەڕەکەی دا دەستم و خوێندمەوە ، تیایدا نووسرا بوو : ئەم شەو خەونم بینی یەکێك پێی وتم : پێغەمبەر ﷺ لە ناو مزگەوت دانیشتووە و خەڵك لە دەورەی دانیشتووە و پێی دەڵێن : چ فەرمانێکت هەیە ئەی پێغەمبەری خوا ؟
پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : من شتێکی زۆر بەنرخم داناوە لە ژێر مینبەرەکە و فەرمانم بە مالك کردووە بۆتان بەش بکات ، جا لێوە بڕۆن بۆ لای مالك .
کاتێك ئیمام گوێی لەمە بوو ، دەستی بەگریان کرد .

- ئەلهەیسەمی کوڕی جەمیل فەرموویەتی : ٤٨ پرسیاریان ئاراستەی ئیمامی مالك کرد ، لە سی و دوو پرسیار فەرمووی : نازانم[23] !!!

---

23 ئەمەش بەڵگەیە لەسەر تەقوا و لەخواترسانی ئیمام .

- خالدی کوڕی خیداش فەرموویەتی : چوومە خزمەت ئیمامی مالك و دەربارەی چل مەسلە پرسیارم لیّ کرد ، تەنیا لە پێنج مەسەلە وەلامی دامەوە !!
- دەراوردی فەرموویەتی : خەونم بینی کە لە مزگەوتی پێغەمبەرم ﷺ ، بینیم پێغەمبەر ﷺ بۆ خەڵك دەدوێ ، لەو کاتە ئیمامی مالك هاتە ژوورەوە ، کە پێغەمبەر ﷺ چاوی پیّ کەوت فەرمووی : وەرە لام .

ئیمامیش لێی نزیك بۆوە ، بینیم پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەکەی لە پەنجەی موبارەکی دەرهێنا و لە پەنجەی ئیمامی مالکی دانا !!

- ئەسەدی کوڕی موسا فەرموویەتی : لەدوای وەفات کردنی ئیمامی مالك ، ئیمامم لەخەون بینی جل وبەرگێکی سەوزی لەبەر بوو بەسواری وشترێك لە نێوان ئاسمان وزەوی دەرۆیشت ، پێم وت : ئەی باوکی عەبدوللاّ : ئەی تۆ وەفاتت نەکرد ؟

فەرمووی : چوومە خزمەت پەروەردگار و قسەم لەگەڵ کرد و پێی فەرمووم : لێم بپرسە تا پێت ببەخشم ... داوا بکە تا بۆت جێبەجیّ بکەم ...

- ئیسماعیلی کوڕی موزاحیمی مەروەزی فەرموویەتی : خەونم بە پێغەمبەر ﷺ بینی ، لێم پرسی : ئەی پێغەمبەری خوا : لەدوای تۆ پرسیار لە کیّ بکەین ؟

فەرمووی : پرسیار لە مالك بکەن .

- ئیمامی مالك فەرموویەتی : تاوەکو ئێستا هەموو شەو خەونم بە پێغەمبەر ﷺ بینیوە !
- موحەممەدی کوڕی روممی توجیبی فەرموویەتی : پێغەمبەرم بینی لەخوندا ، لێم پرسی : ئەی پێغەمبەری خوا : کامەیان باشترە : ئیمامی مالك یان ئیمامی لەیسی کوڕی سەعد ؟

فەرمووی : مالك میراتگری زانستی منە .

- ئیمامی ئیبن مەهدی فەرموویەتی : پیاوێك لە جێگایەکی زۆر دوورەوە هاتە خزمەت ئیمامی مالك و پرسیاری لێ کرد لە مەسەلەیەك .

ئیمام فەرمووی : ئەم مەسەلەیە بە چاکی نازانم !!

پیاوەکە وتی : قوربان : من لە جێگایەکی زۆر دوور هاتووم بۆ لای جەنابت ، تۆش دەڵێی : ئەم مەسەلەیە بە چاکی نازانم ؟!

ئیمام فەرمووی : ئەگەر گەڕایەوە ئەم جێگایە بەخەڵکەکەی بڵێ : مالك ئەم مەسەلەیە بە چاکی نازانێ !!!

- عومەری کوڕی یەزید فەرموویەتی : بە ئیمامی مالکم وت : ئەی باوکی عەبدوڵلا : خەڵك لە جێگای زۆر دوور دێن بۆ لات تا پرسیارت لێ بکەن، کەچی تۆ دەڵێی نازانم !!

ئیمام فەرمووی : ئەی بەندەی خوا : هەندێکیان لە میسر بۆم دێن و هەندێکیان لە عیراق و هەندێکی تر لە شام ، منیش لەوانەیە فەتوایە و بۆچوونەکەم بگۆڕێ، پێم ناڵێی ئەمانە لە کوێ بدۆزمەوە تا پێیان بڵێم : من ئەو فەتوایەم گۆڕیوە کە بۆ ئێوەم دابوو ، جا بۆ خۆتان کار بە فەتوایە نوێیەکەم بکەن !!!

- ئیمامی شافعی فەرموویەتی : لەدوای قورئانی پیرۆز هیچ کتێبێك ڕاستتر نیە لە موەتتەئی ئیمامی مالك[24] .

- هەروەها فەرموویەتی : خزمێکم پێی وتم : ئەمشەو خەونێی زۆر سەیرم بینی .

پێم وت : چیت بینی ؟

وتی : لەخەونمدا یەکێك پێی وتم : ئەمشەو زاناترین کەسی سەر ڕووی زەوی وەفاتی کرد !

کە لێکمان داوە بینیمان ئەو ڕۆژە بوو ئیمامی مالك تیایدا وەفاتی کرد بوو .

---

[24] ئەمە پێش ئەوەی صەحیحی بوخاری و موسلیم دابنرێن ، جا ئاگادار بە .

- ئەلمەئمونی کوڕی خەلیفە هارونی رەشید بە ئیمامی مالکی وت : خانووت هەیە ؟

ئیمام فەرمووی : نەخێر .

ئەلمەئمون وتی : فەرموو ئەمە ۳۰۰۰ دینارە بۆ خۆت خانوویێك بکڕە .

ئینجا وتی : حەز دەکەم لەگەڵتم بگەڕێیەوە بەغدا چونکە دەمەوێ خەڵك بێنە سەر مەزهەبەکەی تۆ .

ئیمام فەرمووی : من ناچمە دەرەوەی مەدینە چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : شاری مەدینە خەڵکی خراپ لە خۆی دوور دەخاتەوە هەرەکو چۆن ئاسنگەر شتی پیس لە ئاسن دوور دەخاتەوە ، هەروەها من رازی نابم هەموو خەڵك بێنە سەر مەزهەبەکەی من و سەر کتێبی ( الموطّأ ) ، چونکە صەحابەکانی پێغەمبەر ﷺ لە هەموو شوێنێك بڵاوبوونەتەوە و لەهەر شوێنێك زانستێکیان بڵاو کردۆتەوە ، ئەمش دیاریەکانتانە ئەگەر حەزتان لێیە بیبەنەوە و ئەگەر حەزتان لێیە بەجێی بێڵن !!

- ئیمام فەرموویەتی : من سواری ئەسپ نابم لە شارێك کە لاشەی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ لەژێر خاکی نێژرا بێت !!!
- کە هارونی رەشید هەواڵی زیرەکی و لێهاتوویی ئیمامی مالکی پێ گەیشت، یەکێکی نارد بەدوای و پێی وت : بە ئیمام بڵێ : وەرە لامان تاکو موەتتەئمان بۆ بخوێنی و سوودی لێ وەرگرین .

کە نێردراوەکە ئەمەی بە ئیمام راگەیاند ، ئیمام فەرمووی : سەلامی منی پێ بگەیەنە و پێی بڵێ : مالك دەڵێ : خەڵك دێتە بەر دەرگای زانست ، زانست ناچێتە بەر دەرگای خەڵك !

که نێردراوەکە گەڕاوە لای خەلیفە و وەڵامەکەی ئیمامی پێ گەیانـد ، خەلیفـە زۆر تووڕە بوو ... لەم کاتە ئیمامی مالـك هاتـە ژوورەوە ، هـارون پێـی وت : بەدوات دەنێرم بەڵام سەرپێچی فەرمانم دەکەی !!

ئیمام فەرمووی : ئـەی ئـەمیری ئیمانـداران : ئیمـامی زوهـری دەگێڕێتـەوە لـە خاریجەی کوڕی یەزید ، ئەویش دەگێڕێتەوە لـە بـاوکی کـە فەرموویـەتی : مـن وەحیم دەنووسی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوارەوە ﴿ لاَ يَسْتَوِي الْقَاعِدُوْنَ مِنَ الْمُؤمِنِيْنَ ﴾[٢٥] ، لەم کاتە حـەزرەتی ئـبن ئـوم مـەکتوم لـە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو ، وتی : ئەی پێغەمبـەری خـوا : مـن مرۆڤێکـی کوێرم و خوای گەورە ئەو ئایەتەی هێناوەتەوە خوارەوە کە ئەو گەورەییەی تیایە، جا چی بۆ من هەیە ؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ( لاَ أدري ) نازانم .

هێشتا قەڵەمەکەم مەرەکەبەکەی وشك نەبوو بوو ، وەحی بۆ پێغەمبـەر ﷺ هاتـە خوارەوە و رانی پێغەمبەر ﷺ کەوتە سەر رانم ، دوای کەمێك فـەرمووی : ئـەی زەید بنووسە : ﴿ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ ﴾[٢٦] .

ئەی ئەمیری ئیمانداران بۆ ئەو سێ وشەیە خوای گەورە حەزرەتی جبریلی نـارد علیە الـسلام لە ڕێگایەك کە پەنجا هەزار ساڵ دوورە ، ئایا بۆ من چاکتر نیـە لـەم زانستە بپارێزم و گەورەییەکـەی بهێڵمـەوە ، خـوای گـەورە لـەم پلـە بـەرزەی داناوی ، یەکەمین کەس مەبە لەم زانستە زەلیل بکەی ، چـونکە ئەگـەر وابکـەی خوای گەورە زەلیلت دەکات !!

لەم کاتە هارونی رەشید هەڵسـاوە و لەگەڵ ئیمامی مالك چووە ماڵەکـەی و لـە جێگایەکی بەرز دانیشت تا گوێ لە موەتتەئەکەی بگرێ .

---

[25] واتە : ئەو کەسانەی دانیشتون و لە جیهاد دوا کەوتون یەکسان نین لەگەڵ ئەو کەسانەی جیهاد دەکەن .

[26] تەنیا ئەوانەی نەخۆش یان پەککەوتەن .

ئیمام فەرمووی : ئەی ئەمیری ئیمانداران : زاناکان وایان پێ چاك بوو قوتابی لە جێگایەکی نزم دابنیشێ بۆ گوێ لێ بوونی زانست .
لەم کاتە هارون هاتە خوارەوە لە جێگایەکی نزم دانیشت !!

- ئیمامی مالك فەرموویەتی : چوومە لای خەلیفە ئەبو جەعفەری مەنسوور ، بینیم لەسەر جێگا کەوتووە و نەخۆشە ، کە هاتمە لای بینیم منالێك هەر دێتە ژوورەوە و دەچێتە دەرەوە !

خەلیفە وتی : دەزانی ئەوە کێیە ؟
وتم : نەخێر .
وتی : کوڕی منە ، لەبەر هەیبەتی تۆ دێت و دەڕوا وئارام نابێ !!
ئینجا هەندێ پرسیاری لێ کردم و منیش وەڵامم داوە .
ئەبو جەعفەر وتی : بەراستی تۆ زاناترین کەسی لە دونیا .
وتم : نەخێر من وانیمە !!
وتی : نەخێر تۆ وای بەڵام دەیشاریەوە !!

- عەبدوڵای کوڕی موبارەك فەرموویەتی : جارێکیان لە خزمەت ئیمام مالك دانیشتبووین و فەرموودەی بۆمان دەگێڕاوە ، بینیم دووپشکێك شانزە جار پێی وەدا و ڕەنگی ئیمام زۆر دەگۆڕا لەگەڵ هەر پێوەدانێك بەڵام فەرموودەکەی ئەبڕی !!

کە تەواو بوو پێمان وت : ئیمام : بۆچی دووپشکەکەت نەکوشت ؟!!
فەرمووی : لەبەر گەورەیی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ سەبرم گرت !!

- ئیبن عەبدولحەکەم فەرموویەتی : ئەگەر پرسیارێك ئاراستەی ئیمامی مالك بکرابووایە ئەیفەرموو : ماوەیەکی تر وەرەوە لام تا وەڵامەکەت بدەمەوە .

پێمان وت : بۆچی یەکسەر وەڵامی نادەیتەوە ؟

ئیمام دەگریا و دەیفەرموو : من لەم پرسیارانە زۆر دەترسم لە رۆژی قیامەت بەرپرسیارم بم لێی !!

- ئیمامی شافعی فەرموویەتی : من لە خزمەتی ئیمام دانیشتبووم ، مرۆڤێك هات و ٤٨ پرسیاری لێ کرد ، ئیمام لە ٣٢ پرسیار فەرمووی : نازانم !!

ئیمامی غەزالی فەرموویەتی : ئەمەش لە تەقواو لەخواترسی ئیمامە ، ئەگینا داواکاری دونیا و ناوبانگی نەفسەکەی رێی پێ نادات بلێ : نازانم !!

- جارێکیان خەلیفە هارونی رەشید لە ئیمامی پرسی : خانووت هەیە ؟

ئیمام فەرمووی : نەخێر .

خەلیفە وتی : ئەوە ٣٠٠٠ دینارە تا خانووێك بۆ خۆت بکڕی .

ئیمامیش پارەکەی لە شوێنێك دانا ، کە خەلیفە ویستی شاری مەدینە جێ بهێلێ یە ئیمامی فەرموو : دەبێ لەگەڵمان بێی بۆ شاری بەغدا چونکە من نیازم وایە هەموو خەڵك بێنمە سەر مەزهەبەکەت !

ئیمام فەرمووی : ئەم شتە ناکرێ ، چونکە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە زۆر شوێن بڵاوبوونەتەوە و لەهەر شوێنێك زانستێکیان بڵاو کردۆتەوە ، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی : ( اخْتِلاَفُ أُمَّتِي رَحْمَةٌ )[27] ، هەروەها فەرموویەتی : ( الْمَدِيْنَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَو كَانُوا يَعْلَمُوْنَ )[28] ، هەروەها فەرموویەتی : ( الْمَدِيْنَةُ تَنْفِي خَبَثَهَا كَمَا يَنْفِي الْكِيْرُ خَبَثَ الحَدِيْدِ )[29] ، ئەوەش دینارەکانتانە بۆ خۆتان بیبەنەوە !!

---

[27] قال الحافظ العراقي : ذكره البيهقي في رسالته الأشعرية تعليقاً و أسنده في المدخل من حديث ابن عباس بلفظ ( اختلاف أصحابي لكم رحمة ) و إسناده ضعيف .

مانای فەرموودەکەش ئەوەیە : جیاوازی راو بۆچوونی زاناکانی ئوممەتم رەحمەتە بۆیان .

[28] أخرجه البخاري و مسلم .

مانای فەرموودەکەش ئەوەیە : شاری مەدینە بۆیان باشترە ئەگەر بزانن .

[29] أخرجه البخاري ومسلم .

# فەرموودەی زانایان دەربارەی ئیمامی مالك

- ئیمامی ئەبو عەبدیللای مەقدیسی حەنبەلی فەرموویەتی : مالك ئیمامێکی فەرموودەناسی گەورە و پێشوای شاری مەدینەیە .
- ئیمامی شافعی فەرموویەتی : ئەگەر ئیمامی مالك و ئیمامی ئیبن عوپەینە نەبوونایە ، زانستی حیجاز نەدەما و دەڕۆیشت .
- عەبدولڕەحمانی کوڕی مەهدی فەرموویەتی : مالك زانایەکی گەورەی سەردەمی خۆی بوو .
- جارێکیان ئیمامی وەکیع فەرموودەی دەگێڕاوە و هەر دەیفەرموو : ڕاستگۆ پێی وتم ... ڕاستگۆ پێی وتم ...

لێیان پرسی : کێیە ئەو ڕاستگۆیە ؟

فەرمووی : مالکی کوڕی ئەنەس !

- ئیمامی ئەحمەد فەرموویەتی : ئیمامی مالك لە هەموو کەسێك فەرموودەکانی ڕاستترە کە لە ئیمامی زوهری دەگێڕێتەوە .
- ئیمامی ئیبن ئەبی خەیسەمە فەرموویەتی : باشترین قوتابی ئیمامی زوهری : مالکی کوڕی ئەنەسە .
- ئیمامی ئیبن مەهدی فەرموویەتی :کەسم لە ئیمامی مالك ئاقڵتر نەبینیوە .
- ئیمامی نەسائی فەرموویەتی : یەکێك لە پارێزەرانی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ ئیمامی مالکە .

---

مانای فەرموودەکەش ئەوەیە : شاری مەدینە مرۆڤی پیس و ناپاك لە خۆی دوور دەخاتەوە هەروەکو چۆن کوورەی ئاسن پیسی ئاسن دوور دەخاتەوە .

- کاتێك هەواڵی مردنی ئیمامی مالك گەیشتە ئیمامی ئبن عویەینە فەرمووی : هیچ کەسێکی وەك خۆی لەدوای خۆی جێ نەهێشتووە .
- ئیمامی ئەوزاعی فەرموویەتی : مالك زانای زانایان و موفتی مەککە و مەدینەیە .
- ئیمامی ئەبو یوسف فەرموویەتی : کەسم لەو سیانە زاناتر نەبینیوە : ئیمامی ئەبو حەنیفە و مالك و ئبن ئەبی لەیلا .
- ئیمامی یەحیای قەتتان فەرموویەتی : مالك شایەنی ئەوەیە خەڵك لەسەر ڕێگاکەی بڕوا .
- ئیمامی ئەسەدی کوڕی فورات فەرموویەتی : ئەگەر دەتەوێ ڕەزامەندی خوای گەورە بەدەست بێنی ، بەدوای ئیمامی مالك بکەوە .
- ئیمامی ئەبو عاصمی نەبیل فەرموویەتی : تاوەکو ئێستا فەرموودەناسێکی دەم و چاو جوانی وەکو ئیمای مالکم نەبینیوە .
- ئیمامی سوفیانی کوڕی عویەینە فەرموویەتی : مالك زۆر شارەزا بوو لەو پیاوانەی فەرموودەیان گێڕاوەتەوە .
- یەحیای کوڕی سەعید فەرموویەتی : فەرموودەکانی مالك لەفەرموودەی پیاوانی تر ڕاسترن .
- ئبن لەهیعە فەرموویەتی : موحەممەدی کوڕی عەبدولرەحمان لە مەدینە گەڕاوە و هاتە لامان ، لێمان پرسی : کێ لە مەدینە فەتوا دەدات ؟

وتی : گەنجێك فەتوا دەدات ناوی مالکی کوڕی ئەنەسە .

- وەهەیب فەرموویەتی : کەس لە دونیا زاناتر نیە لە مالك .
- ئەلواقیدی فەرموویەتی : مالك مرۆڤێکی خاوەن هەیبەت بوو ، مەجلیسەکەشی مەجلیسی حەیا وشەرم و ڕێزلێنان بوو .

- موحەممەدی کوڕی سەعید فەرموویەتی : مالك پیاوێکی ئەمینی باوەڕپێکراوی لەخواترسی تێگەیشتووی موجتەهید بوو .
- ئیمامی ئەبو نوعەیم فەرموویەتی : مالك ئیمامی مەککە و مەدینەیە ، یەکێك بوو لە پیاوە گەورەکان و مرۆڤە ناقڵەکان و ، یەکێك بوو لە موتتەقیەکان .
- ئەبو موصعەب فەرموویەتی : مالك فەرموودەی پێغەمبەری ﷺ نەدەگێڕاوە ئەگەر دەست نوێژی نەبووایە لەبەر گەورەیی فەرموودەی خۆشەویست ﷺ .
- ئیمامی شوعبە فەرموویەتی : لەدوای سالێك لە وەفات کردنی نافع هاتم بۆ شاری مەدینە ، بینیم ئەلقەی زانست بۆ ئیمامی مالك بەسراوە .
- ئەلقەواریری فەرموویەتی : لەلای ئیمامی حەممادی کوڕی زەید دانیشتبووم ، کە هەواڵی وەفات کردنی مالکی پێ گەیشت فەرمووی : رەحمەتی خوا بەسەر باوکی عەبدوللا بڕژێ ، بەراستی جێگایەکی بەرزی لە ئایینی خوا هەبوو .
- ئەلقەعنەبی فەرموویەتی : هاتینە خزمەت ئیمامی سوفیانی کوڕی عویەینە ، بینیمان زۆر غەمبارە ، لێمان پرسی : قوربان چی رووی داوە ؟

فەرمووی : ئیمامی مالك وەفاتی کردووە ، کەسی هاوشێوەی لەدوای خۆی جێ نەهێشتووە .

- ئیمامی عەبدولرەحمانی کوڕی مەهدی فەرموویەتی : مالك لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ پێشەوایە .
- ئیمامی ئیبن حەمماد فەرموویەتی : مالك ئیمامی مەدینەیە و خاوەن فەزڵێکی گەورەیە و زۆر فەرموودەی پێغەمبەری ﷺ بەگەورە دەزانی و ، لە رادە بەدەر پێغەمبەری ﷺ خۆش دەویست و بەردەوام نوێژی لەسەر مردووەکان دەکرد و سەردانی نەخۆشانی دەکرد و بەردەوام لە مزگەوت دادەنیشت .

- ئیمامی زەهەبی فەرموویەتی : مالك پێشەوایەکی فەرموودەناسی موجتەهیدی ئوممەتی ئیسلامە .
- ئیمام ئیبن وەهب فەرموویەتی : ئەگەر ئیمامی مالك و لەیس نەبوونایە ئێمە گومڕا دەبووین !
- عەبدولڕەحمانی کوڕی واقید فەرموویەتی : من دەرگای ئیمامی مالکم بە دەرگای کاربەدەستانم ئەچواند لەبەر قەڵەبالغی .
- ئیمامی ئەبو داوود فەرموویەتی : بەهێزترین فەرموودە ئەو فەرموودەیە کە ئیمامی مالك لە نافع دەگێڕێتەوە ، ئەویش ئەگێڕێتەوە لە حەزرەتی ئیبن عومەر خوا لێی رازی بێ .
- ئیبن هورمز فەرموویەتی : ئیمامی مالك زانای هەموو خەڵکە .
- ئیمامی ئیبن حیببان فەرموویەتی : مالك یەکێکە لە گەورە پیاوان و لەزانا تێگەیشتوو و پیاو چاکان و ، زۆر بەرگری لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ دەکرد .
- ئیمامی ئیبن مەهدی فەرموویەتی : چوار ئیمام هەبوون لە فەرموودە لە سەردەمی خۆیان : مالك لە حیجاز و ، ئەوزاعی لە شام و ، سوفیانی سەوری لە کووفە و ، حەممادی کوڕی زەید لە بەصرە .
- ئیمامی نەسائی فەرموویەتی : سێ زانا هەن فەرموودەی پێغەمبەریان ﷺ پاراست : شوعبەی کوڕی حەججاج و یەحیای کوڕی سەعیدی قەتتان و مالکی کوڕی ئەنەس .
- ئیمامی ئیبن خەللیکان فەرموویەتی : مالك ئیمامی شاری مەدینەیە و یەکێکە لە پیاوە ناسراوەکان .

# باسی هەندێ فەرموودە کە ئیمامی مالك لە ئیسنادەکەی دایە

١ـ ئیمامی ئەبو نوعەیم فەرموویەتی : موحەممەدی کوڕی حەمید پێی وتین : موحەممەدی کوڕی سولەیمان پێی وتین : موحەممەدی کوڕی عەبدولڕەحمان پێی وتین : عەبدوللای کوڕی موحەممەد پێی وتین : مالکی کوڕی ئەنس پێی وتین و دەگێڕێتەوە لە موحەممەدی کوڕی ئەلمونزیر ، ئەویش دەگێڕێتەوە لە عوروە ، ئەویش دەگێڕێتەوە لە حەزرەتی عائیشە خوا لێی رازی بێ فەرموویەتی : پیاوێك ویستی بێتە مالی پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی : ( بِئْسَ أخو العَشِيرَةِ )[٣٠] .

کە هاتە ژوورەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد سەرینێکی بۆ دابنێن ، کە چووە دەرەوە لێم پرسی : ئەی پێغەمبەری خوا : یەکەمین جار بە پیاوێکی خراپ ناوزەدت کرد ، کە هاتە ژوورەوە فەرمانت کرد سەرینێکی بۆ دابنێن .

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ( إنَّ مِنْ شِرَارِ النَّاسِ الذِيْنَ يُكْرَمُوْنَ اتقاءَ شَرِّهِمْ )[٣١] ، واتە : بێ گومان ئەو کەسانە خراپترین کەسن کە خەلّك ڕێزیان لێ دەنێن بۆ دوور کەوتنەوە لە خراپەیان .

٢ـ ئیمامی موسلیم فەرموویەتی : ئیسحاقی کوڕی موسای ئەنصاری پێی وتم : مەعەن پێی وتم : مالك پێی وتین و دەگێڕێتەوە لە عەبدوللای کوڕی یەزید خزمەتکاری ئەلئەسوەدی کوڕی سوفیان ، ئەویش دەگێڕێتەوە لە ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدولڕەحمان و موحەممەدی کوڕی عەبدولڕەحمان ، ئەوانیش دەگێڕنەوە لە حەزرەتی ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێ کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( إنْ كَانْ

---

30 واتە : بەرامبەی پیاوێکی خراپە .

31 قال ابو نعيم في الحلية ٦/٢٣٥ : صحيح متفق عليه من حديث عروة عن عائشة غريب من حديث مالك عن محمد تفرّد به عنه عبدالله بن محمد .

الحَرُّ فَأبْرِدُوا عَنِ الصَّلاَةِ فَإنَّ شِدَّةِ الحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّم )[٣٢] ، واته : ئەگەر نیوەڕۆ زۆر گەرم بوو ئەوا نوێژەکە کەمێك دواخەن تا گەرماییەکە کەمتر دەبێتەوە ، چونکە ئەم گەرماییە لە ئاگری دۆزەخەوەیە .

٣- ئیمامی ئیبن ماجە فەرموویەتی : موحەممەدی کوڕی یەحیا پێی وتین : ڕەوحی کوڕی عوبادە پێی وتین : مالکی کوڕی ئەنەس پێی وتین و دەگێڕێتەوە لە ئەبولزیناد، ئەویش دەگێڕێتەوە لە ئەلئەعرەج ، ئەویش دەگێڕێتەوە لە حەزرەتی ئەبو هورەیرە خوا لێی رازی بێ فەرموویەتی : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( إذَا وَلَغَ الكَلْبُ فِي إنَاءِ أحَدِكُمْ فَلْيَغْسِلْهُ سَبْعَ مَرَّاتٍ )[٣٣] ، واتە : ئەگەر سەگێك دەمی لەناو قاپی یەکێکتان نا ، با حەوت جار بیشۆری .

بزانە : دەبێ یەکێك لەو حەوت جارە خۆڵی لەگەڵ بێ هەروەکو لە ریوایەتی تر هاتووە .

٤- ئیمامی نەسائی فەرموویەتی : قوتەیبە پێی راگەیاندین و دەگێڕێتەوە لە ئیسحاقی کوڕی عەبدوللا ئەویش دەگێڕێتەوە لە حەزرەتی ئەنەس خوا لێی رازی بێ فەرموویەتی : پێغەمبەرم بینی ﷺ لە کاتی نوێژی عەسر ، خەڵك داوای ئاوی کرد بۆ دەست نوێژ بەڵام دەستیان نەکەوت ، لەم کاتە کەمێك ئاویان هێنا لەناو قاپێك بۆ پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەریش دەستی موبارەکی لەناو دانا و فەرمانی بەخەڵك کرد دەست نوێژ بشۆن ، بەچاوی خۆم بینیم ئاو لە پەنجە پیرۆزەکانی دەهاتە دەرەوە تاوەکو هەموویان دەست نوێژیان شوشت ئاوەکە نەبڕا[٣٤] .

٥- ئیمامی زەهەبی فەرموویەتی : عەبدولرەحمانی کوڕی عومەر پێی راگەیاندین کە عومەری کوڕی موحەممەد پێی راگەیاندین کە ئەبو موحەممەد پێی راگەیاندین کە

---

[32] صحیح مسلم ٥/١١٩ .

[33] سنن ابن ماجه ١/١٣٠ .

[34] سنن النسائي ١/٦٠ .

ئیبنولموزەففەر پێی راگەیاندین کە ئیمامی تەحاوی پێی راگەیاندین کە موزەنی پێی راگەیاندین کە ئیمامی شافعی پێی راگەیاندین کە مالك پێی راگەیاندین و دەگێڕێتەوە لە ئەبولنەزر ، ئەویش دەگێڕێتەوە لە ئەبو سەلەمە ، ئەویش دەگێڕێتەوە لە حەزرەتی عائیشە فەرموویەتی : هەندێ جار پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە بەرۆژوو دەبوو تا دەمانووت هەموو رۆژ بەرۆژوو دەبێ ، هەندێ جاریش بەردەوام بەرۆژو نەدەبوو تا دەمانووت هیچی تر بەرۆژوو نابێ ، هەرگیز نەمدیوە پێغەمبەر ﷺ هەموو رۆژانی یەك مانگ بەرۆژوو بێ جگە لە مانگی رەمەزان نەبێ ، لەدوای رەمەزان زۆربەی رۆژەکانی مانگی شەعبان بەرۆژوو دەبوو[35] .

ئیمامی زەهەبی فەرموویەتی : عەبدولموئمینی کوڕی خەلەف پێی راگەیاندین کە موحەممەدی کوڕی ئیبراهیمی ئەنصاری پێی راگەیاندین کە ئەبو موحەممەدی کوڕی عەبدوللا پێی راگەیاندین کە ئەحمەدی کوڕی موحەممەد و ئەحمەدی کوڕی عەبدولرەحمانی بەتروجی وتیان : موحەممەدی کوڕی فەرەج پێی وتین : یونسی کوڕی عەبدوللا پێی راگەیاندین کە باوکی پێی وت : ئیمامی مالك پێی وتم و دەگێڕێتەوە لە نافع ، ئەویش دەگێڕێتەوە لە حەزرەتی ئیبن عومەر خوا لێی رازی بێ کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی : ( الذِي تَفُوتُهُ صَلاةُ العَصْرِ كَأنّما وُتِرَ أهْلَهُ و مَالَهُ )[36] ، واتە : ئەو کەسەی نوێژی عەسری دەچێ وەکو ئەو کەسە وایە ماڵ و منالی لێ فەوتا بێ .

[35] تذكرة الحفاظ ٣/٨١١ .

[36] تذكرة الحفاظ ٣/١٣٧٢ .

# هەندێ لە فەرموودەكانی ئیمامی مالك

ئیمامی مالك فەرموویەتی :

- كاتێك فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دەخوێندرێتەوە ، نابێ هیچ كەسێ دەنگی بەرز بكاتەوە ، چونكە ئەو كەسەی دەنگی خۆی بەسەر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بەرز دەكاتەوە هەروەكو لەو كەسەیە كە دەنگی خۆی لەسەر زاتی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ بەرز كردۆتەوە .
- دونیا نەویستی ئەوەیە لیش و كارت حەلاڵ بێ و ، هیوات بە دونیا نەبێ .
- ئەگەر پیاو مەدحی خۆی كرد ، جوانی دەموچاوی لەڕوا ونامێنێ .
- لە رۆژی قیامەت مرۆڤ بەهەردوو چاوی خۆی جوانی خوای گەورە دەبینێ .
- من فەتوام نەدا تاكو ٧٠ زانا شاهێدیان دا لەسەر لەوەی من شایەنی فەتوادانم .
- نابێ كەس فەتوا بدات تاكو پرسیار لە یەكێكی لەخۆی زاناتر ئەكا : ئایا شایەنی فەتوا دانە یان نا ؟
- من پێم باش نیە مرۆڤێك بەوەستاوی گوێ بداتە فەرموودەكانی پێغەمبەر ﷺ، پێم چاكە دابنیشێ ئینجا گوێ بگرێ .
- خالیدی كوڕی خیداش فەرموویەتی : بە ئیمامی مالكم وت : وەسیەتم بكە .

فەرمووی : لەخوای گەورە بترسێ و داوای فەرموودە لەو كەسانە بكە كە شایەنی گێڕانەوەی فەرموودەن .

- زانست نوورێكە خوای گەورە لەناو دڵی مرۆڤ دایدەنێ ، زانست بەزۆری ریوایەت كردن نیە .
- واجبە لەسەر لەو كەسەی داوای زانست ئەكا خاوەن هەیبەت و لەسەرخۆ و هێمن بێ .

- ئەگەر مرۆڤێك چاكە لەگەڵ خۆی نەكات ، چاكە لەگەڵ خەڵكیش ناكات .
- زانست لەو كەسە وەرگرە كە دەزانی چی دەڵێ .
- نزیكەی حەفتا كەسم بینی لە تابعیەكان ، فەرموودەم تەنیا لەو كەسانە وەرگرت كە باوەڕپێكراو بوون .
- خواپەرستێك هەبوو لە شام ، كاتێك صەحابەكانی بینی وتی : سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە حەواریەكانی حەزرەتی عیسا علیه السلام نەگەیشتوونەتە ئەو خواپەرستیەی كە صەحابەكانی موحەممەد ﷺ ئەیكەن .
- وام پێ گەیشتووە كە حەزرەتی عیسا علیه السلام فەرموویەتی : ئەی خەڵكینە قسە زۆر مەكەن بەبێ یادی خوای گەورە ، چونكە زۆر قسەكردن دڵی مرۆڤ رەق دەكات ، دڵی رەقیش لەخوای گەورە دوورە .
- پێویستە لەسەر مرۆڤ رەوشتی بەرز فێر بێ ئینجا داوای زانست بكات .
- ئەو كەسە زانیاری كۆدەكاتەوە و سوودی لێ دەبینێ كە بە هەژاری و نەبوونی داوای زانست دەكات .
- كاتێك هەستم دەكرد كەوا دڵم رەق بووە ، دەچووم بۆ دیتنی وەلی خوای گەورە موحەممەدی كوڕی مونكەدیر ، هەر كە چاوم پێ دەكەوت ئەهاتمەوە سەر خۆم .
- زانست بە زۆری لەبەر كردن و خوێندنەوە نیە ، بەڵكو رووناكیەكە خوای گەورە لە ناو دڵی مرۆڤ دایدەنێ .
- هەر كەسێ راستگۆ بێ و درۆ نەكا ، خوای گەورە ئەقڵەكەی كەم ناكاتەوە و لە پیری دەیپارێزێ .
- كەم كەس هەیە زانستم لێ وەرگرتبێ ، لە كۆتایی نەهاتبێتە لام وفەتوام لێ وەرنەگرێ !

## کتێبەکانی ئیمام

ئیمامی مالك هەندێ کتێبی داناوە وەکو :

١ـ الموطأ : تایبەتە بە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ ، ئیمام فەرموویەتی : لەم کتێبەم بە ماوەی شەست ساڵ دانا و کاتێ تەواو بووم فڕێم دا ناو ئاو و وتم : خوایە ئەگەر بۆ تۆ بێ تەڕ نابێ ئەگەر نا تەڕ دەبێ .

کە کتێبەکەم لەناو ئاوەکە دەرهێنا بینیم تەڕ نەبووە ...

٢ـ رسالة في الوعظ .

٣ـ الرد على القدرية .

٤ـ تفسير غريب القرآن[٣٧] .

دەربارەی ( الموطأ ) سەعدونی وارجینی فەرموویەتی :

أقول لمن يروي الحديث و يكتب
و يسلك سبيل الفقه فيه و يطلب

إن شئت أن تدعى لدى الناس إماماً
فلا تعدُ ما تحوي من العلم يشرب

أتترك داراً كان بين بيوتها
يروح و يغدو جبرئيل المقرّب

و مات رسول الله و فيها بعده
بسنته أصحابه قد تأدبوا

[37] ئەم کتێبانە مامۆستا خەیرەددین زیرەکلی لە کتێبی ( الأعلام ١٢٨/٦ ) باسی کردوون .

و فرّق شمل العلم في تابعيهمو

فكل امرىء منهم له منه مذهب

فخلصه بالسبك للناس مالك

و منه صحيح في الجس و أجرب

فبادر موطّأ مالك قبل موته

فما بعده إن فات للحق مطلب

و دع للموطأ كل علم تريده

فإن الموطّأ الشمس و الغير كوكب

و من لم يكن كتب الموطا ببيته

فذاك من التوفيق بيت مخيب

جزى الله منا في موطاه مالكاً

بأفضل ما يجزي اللبيب المهذب

لقد فاق أهل العلم حياً ومّيتاً

فصارت به الأمثال في الناس تضرب

فلا زال يسقي قبره كل عارض

بمندفق ظلت عزاليه تسكب

واته : من بهو كهسه دهڵێم كه داواى فهرمووده و ( فقه ) دهكات ، لهگهر حهزت لێيه خهڵك به زانا ناوت بێنن لهوا برۆ بۆ شارى مهدينه و داواى زانست بكه ، ههر لهو شاره حهزرهتى جبريل عليه السلام وهحى بۆ پێغهمبهر ﷺ دههێنا و ههر لهوێ پێغهمبهر ﷺ وهفاتى كردووه ، لهدواى لهو صهحابهكانى زانستيان بلاوكردهوه له نێو خهڵك ، تا ئيمامى مالك كۆى كردهوه ، جا خۆت بگهيهنه موهتهئهكى كه ههموو زانستێكى تيايه ، خواى گهوره پاداشتى ئيمامى مالك بداتهوه ، ئێستاش خهڵك نموونه به زيرهكايهتى لهو دێنهوه .

# وەفات کردنی ئیمام

لە بەیانی رۆژی چواردەی مانگی رەبیعولئەووەلی سالی ١٧٩ی کۆچی ، هەندیَ لە قوتابیانی ئیمام چوونە مالەکەی و سەردانیان کرد تا بزانن نەخۆشیەکەی چی بەسەر هاتووە ، کە چوونە خزمەتی پێیان وت : ئێستا حالت چۆنە ؟
فەرمووی : أشهد أن لا إله الاّ الله و اشهد أن محمداً رسول الله ، خوای گەورە هەموو شتێکی تەقدیر کردووە ، بەیانی کە ئەگەنە خزمەت خوای گەورە رەحمەتی پەروەردگار بە شێوەیەکی وا ئەبینن کە بەخەیالتان نایەت .
ئینجا وەسیەتی کرد کفنەکەی سپی بێ ... دوای ماوەیەکی کورت رووحی پاکی دەرچوو ، ئیبن زەنبەر و ئیبن کەنانە و کورەکەی یەحیا و حەبیبی نووسەری چاویان نوقاند و شۆردیان ، پاشان لە گۆرستانی بەقیع لە شاری مەدینە نێژرا و والی شاری مەدینە عەبدوللای کوری موحەممەد نوێژی لەسەر کرد .
تەمەنی لە نێوان ٨٥ـ٨٦ سال بوو رەحمەتی خوای لێ بێ ، عومەری کوری یەحیا فەرموویەتی : لەو شەوەی ئیمام وەفاتی کرد یەکێك لەخەوما پێی وتم :

لَقَدْ أصبَحَ الإسلامُ زُعْزِعَ رُكْنُهُ
غداةَ ثوَى الهَادِي لَدى ملحَدِ القَبْرِ
إمامُ هُدَىً مَا زَالَ للعِلْمِ صَائِنـاً
عَلَيْـهِ سَلامُ اللهِ فِـي آخِـرِ الدَّهْـرِ

واتە : بزانن ئیسلام لەم کاتە کۆڵەگەکەی جوولاوە وهەژاوە ، لەو کاتەی هیدایەتدەری خەڵك لە ناو گۆڕ دانرا ، ئیمامی بەتەقواو پارێزەری زانست ، سەلامی خوای لێ بێ تا کۆتایی زەمانە .

بەمردنی تۆ ئەی ئیمام موسڵمانان دڵیان هەژا ...

بە مردنی تۆ ئەی خۆشەویست زاناکان غەمبار بوون ...

بەمردنی تۆ دەریایەك لە زانست شاردراوە ئەی ئیمامی گەورە ...

ئەی پارێزەری فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ...

ئەی مامۆستای زانایان ...

ئەی پێشەوای موتەقیان ...

ئەی هیدایەتدەری گومڕاکان ...

ئەی ئەستێرەی گەشاوی ئاسمانی زانایان ...

ئەی بارانی هەوری تەقواو زانست ...

ڕەحمەت و سەلام و بەرەکەتی پەروەردگار بڕژێ بەسەر گیانی پاکت ...

ئەی خۆشەویستی دڵ و ڕووناکی چاوم ...

# ناوی ئیمام

ناوی ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی حەنبەلی کوڕی هیلالی کوڕی ئەسەدی زوهەلی شەیبانی مەروەزی بەغدادیە .

# لەدایك بوونی

ئیمام لە شاری بەغدا لە مانگی رەبیعولئەووەلی ساڵی ١٦٤ی کۆچی لەدایك بووە ، و هەر لەو شارە گەورە بووە و هەر لەو شارە وەفاتی کردووە ، ئەم بەڕێزە بۆ زۆر جێگا سەفەری کردووە بۆ داواکردنی زانست ، وەکو : مەککە و مەدینە و کووفە و بەسرە و یەمەن وشام و جەزیرە ، یەکەم داواکردنی بۆ فەرمووده لە ساڵی ١٧٩ی کۆچی بوو .

# مامۆستایەکانی

ئیمامی ئەحمەد لە ژمارەیەکی یەکجار زۆر ئیمام و زانا زانستی وەرگرتووە ، لەمانەی خوارەوە ناوی هەندێکیانن :

- ئیمامی سوفیانی کوڕی عویەینە .
- قازی ئەبو یوسف .
- ئیسماعیلی کوڕی عولەیە .
- یەحیای کوڕی سەعیدی قەتتانی فەرموودەناس .
- ئیمامی شافعی .
- عەبدولڕەزاقی فەرموودەناس .
- ئیبن ئەبی شەیبەی فەرموودەناس .
- خالیدی کوڕی حاریس .
- ئیمامی حەفصی کوڕی غیاس .
- یەزیدی کوڕی هارون .
- عەلی کوڕی عاصیم .
- ئیسحاقی ئەزرەق .
- عەبدوللای کوڕی نومەیر .

زۆر مامۆستای تریش کە ژمارەیان نزیکەی ٢٨٠ مامۆستایە .

# میحنەتی ئیمام

دوای ئەوەی ئەلمئمون بوو بەخەلیفە ، موعتەزیلەکان ئەو بیروباوەڕەیان بۆ ڕازاندەوە کەوا قورئانی پیرۆز کە فەرموودەی خوای گەورەیە دروست کراوە[38]، خەلیفەش ئەم بیروباوەڕەی گرتە بەر و زانایانی بانگ دەکرد ، ئەگەر ئەوانیش بەم قسەیە ڕازی بوویان وازی لێ دەهێنان ، ئەگەر نا سزا وئازار دەدران و بەند دەکران ، لە پێشەنگی هەموویان ئیمامی ئەحمەد بوو ، پێش ئەوەی بیبەن بۆ لای خەلیفە ... ئەبو جەعفەری ئەنباری هاتە لای و وتی : ئەی ئیمام : تۆ پێشەوای خەڵکی ئێستا ، ئەگەر بەم بیروباوەڕە خراپە ڕازی بی ئەوا خەڵکێکی یەکجار زۆر بەدوات دەکەوێ ئەوانیش ڕازی دەبن ، ئەگەر ڕازیش نەبی هەروا، ئەگەر ئەم پیاوە نەشتکوژێ تۆ هەر دەمری ، جا لە خوای گەورە بترسێ و بەمە ڕازی مەبە .

کە ئیمام ئەمەی بیست گریا و وتی : ماشاء الله ... ما شاء الله ...

ئینجا بردیان بۆ لای خەلیفە ، کە گەیشتە لای خەلیفە لێی پرسی : قورئان دروست کراوە یان نا ؟!!

ئیمام فەرمووی : قورئانی پیرۆز فەرموودەی خوای گەورەیە و دروست نەکراوە .

کە خەلیفە ئەمەی بیست فەرمانی دا بە ۱۵۰ پیاوی خۆی بە قامچی لە ئیمام بدەن !!!

[38] بەلام بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز فەرموودەی خوای گەورەیە

ئەبو زەر کە سەرکردەی ئەم ستەمکارانە بوو وتی : هەریەکەمان تا ماندوو دەبوو لێی دەدا !!! ئینجا یەکێکی تر دەهات و لێی دەدا تا ماندوو دەبوو و هەروەها !!!

ئیمام فەرموویەتی : ئەوەندە لێیان دام لەهۆش خۆم چووم ، هەر ئەوەندەم زانی وا لە بەندیخانە فڕێ دراوم !!!

ئیمام فەرموویەتی : لەو کاتەی ویستیان لە پشتم بدەن ئازیەیان وابوو جل و بەرگم داکەنن ، منیش ئەو دوعایەم کرد : خوایە : ئەگەر من لەسەر هەقم ... مەهێڵە عەورەتم دیارکەوێ !

لەبەر ئەوە جل و بەرگی ئیمام لە هەوا وەستا و نەکەوتە خوارەوە و هەر چوار دەوری ئیمامی دابوو و نەیهێشت عەورەتی دیارکەوێت !!

هۆیەکەشی ئەوەبوو کە ئیمام دوو مووی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ لەناو ئەم جل وبەرگەی دابوو بۆ تەبەڕوك هەروەکو خۆی وا فەرموویەتی .

ئەبو زەری ستەمکار هەر لە دونیا بە سزای خۆی گەیشت و خوای گەورە بەڵەك ( گڕوو ) کرد لە سزای ئازاردانی ئیمام !

لەبەر ئەم هەموو ئازارە ، ئیمام پێش ئەوەی وەفات بکات لە جیاتی ئەوەی میز لە پێشەوەی بێتە دەرەوە خوێنی لێ دەردەچوو !!!

ئەم میحنەتی ئیمام بەردەوام بوو تا ساڵی ۲۲۰ ی کۆچی تا بوونی ئەلواسق بیللا بە خەلیفە ، ئەم خەلیفەیە ئیمامی لە بەندیخانە دەرهێنا ، بەڵام کە ئەلموتەوەککیل بوو بە خەلیفە زۆر ڕێزی لە ئیمام دەگرت و بەهەموو شێوەیەك دەیویست ڕازی بکات .

# کتێبەکانی ئیمام

ئیمام چەند کتێبێکی داناوە ، لەوانە :

١ـ المسند : تایبەتە بە فەرموودە .

٢ـ التأریخ : تایبەتە بە مێژوو .

٣ـ الناسخ والمنسوخ .

٤ـ الرد على الزنادقة .

٥ـ التفسير .

٦ـ فضائل الصحابة .

٧ـ المناسك .

٨ـ الزّهد .

٩ـ العلل و الرجال .

# شێوەی ئیمام

ئیمام مرۆڤێکی درێژی دەم و چاو جوانی کەمێك ئەسمەر بوو ، بەردەوام جل و بەرگی سپی لەکردەبەر رەحمەتی خوای لێ بێ ، ئیمامی ئەبو داوود فەرموویەتی : ئیمامی ئەحمەد پیاوێکی دەم وچاو جوانی رێکوپێك بوو ، بەردەوام جل و بەرگی ئەسموور و سپی لەکردەبەر .

# قوتابیەکانی ئیمام

ئیمامی ئەحمەد ژمارەیەکی یەکجار زۆر قوتابی هەبوو کە ئەمانە ناوی هەندێکیانن :

- ئیمامی بوخاری .
- ئیمامی موسلیم .
- ئیمامی ئەبو داوود .
- عەلی کوڕی مەدینی فەرمووودەناس .
- ئەبو زورعەی رازی فەرمووودەناس .
- ئەبو حاتەمی فەرمووودەناس .
- بەقی کوڕی موخەللەدی فەرمووودەناس .
- ئبن ئەبی خەیسەمەی فەرمووودەناس .
- ئیمامی بەغەوی .
- ئبن ئەبیلدونیای فەرمووودەناس .
- ئەحمەدی کوڕی فورات .
- ئەبو بەکری ئەسرەم .
- ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم .
- ئەبو عوبەیدوللای بۆشەنجی .

زۆر قوتابی تریش .

# ئەحوال و کەراماتی ئیمام

- عەبدوڵڵای کوڕی ئیمام فەرموویەتی : باوکم لە شەو و رۆژێک ٣٠٠ رەکعەت نوێژی دەکرد ، بەڵام کە قامچیەکانیان لێدا کردی بە ١٥٠ رەکعەت ، لەحەوت رۆژ جارێک قورئانی خەتم دەکرد ، کە شەویش دادەهات سەعاتێک نوێژی دەکرد ئینجا کەمێک دەخەوت ، ئینجا هەڵدەستاوە و تا بەیانی شەونوێژی دەکرد !!!
- کاتێک لافاوە گەورەکەی شاری بەغدا رووی دا لە ساڵی ٧٢٠ی کۆچی ، ئاوەکە لە هەر چوار دەورەی قەبری ئیمامی ئەحمەد وەستا و تەنانەت ئەو حەسیرانەی دەوری قەبرەکەشی تەڕ نەکرد !!!
- ئەحمەدی کوڕی موحەممەد فەرموویەتی : من لە ناو دەریا بووم لەو رۆژەی ئیمامی ئەحمەد وەفاتی کرد ، گوێم لە دەنگێک بوو فەرمووی : بەندە لەخواترسە چاکەکە مرد کە ناوی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە !!!
- سەلەمەی کوڕی شەبیب فەرموویەتی : لەلای ئیمامی ئەحمەد دانیشتبووین ، یەکێک هاتە ژوورەوە و لێی پرسین : کامەتان ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە ؟

یەکێک ئاماژەی بۆ ئیمام کرد .

پیاوەکە وتی : من لە شوێنێک هاتووم کە ٤٠٠ فەرسەخ لێرە دوورە[39] ، هەر بۆ بینینی تۆش هاتوومە ، لەخەومدا یەکێک پێی وتم : برۆ بۆ لای ئیمامی ئەحمەد و پێی بڵێ خوای گەورە لە تۆ رازییە و فریشتەکانی ئاسمان و زەویش لە تۆ رازین !!

---

[39] کە نزیکەی ١٠٠٠ کیلۆمەترە !!

• بازرگانێك لەسەر خۆی واجب کرد کە چەند قازانجی پێ دەگات لە قافلەکەی ، هەمووی بدات بە ئیمامی ئەحمەد ، بینی قازانجەکەی ١٠٠٠٠ درهەمە ، کە بۆ ئیمامی برد پێی وت : قوربان : ئەم پارەیەم بۆ جەنابت هێناوە ، ئیمام سەیری کرد و فەرمووی : ئێمە حاڵمان باشە ، خوای گەورە پاداشتی خێرت بداتەوە !!!

پارەکەی لێ وەرنەگرت !!

• ئەحسەنی کوڕی عەبدولعەزیزی جەدەوی فەرموویەتی : سێ هەزار دینارم بە دیاری بۆ ئیمامی ئەحمەد برد ، کە ویستم پێی بدەم فەرمووی : پێویستیم پێ نیە ، سوپاس بۆ خوا پارەم هەیە !!!

• صالحی کوڕی ئیمام فەرموویەتی : : هەندێ جار باوکم ئەدیت وردە نانی رەقی هەڵدەگرتەوە و لەناو قاپێکی دادەنا و ئاوی بەسەردا ئەکرد تا نەرم بێ، هەرگیز نەمبینیوە میوە بخوا مەگەر گندۆرە نەبێ بە نان یان خورما بیخوا و ، هەندێ جار نەخۆش دەبووم باوکم ئاوێکی دەهێنا و هەندێ قورئانی لەسەر ئەخوێندەوە و فووی لەم ئاوە دەکرد و دەیفەرموو : بیخۆوە و دەم و چاوی خۆلی پێ بشۆ .

• ئەلمەروەزی فەرموویەتی : لە هیچ مەجلیسێك هەژارم نەدیوە بە عیززەت و سەربلند بێ وەکو هەژارەکان لە مەجلیسی ئیمامی ئەحمەد سەر بلند بوو ، ئیمامی ئەحمەد رووی لەوان دەکرد و پشتی لە دەوڵەمەندەکان دەکرد ... پیاوێکی لەسەرخۆ بوو و ، پەلەی نەدەکرد و خۆی بەکەم دەزانی ، کاتێك بۆ فەتوا دادەنیشت لە دوای عەسر تا پرسیاری لێ نەکرابووایە قسەی نەدەکرد ، مرۆڤێکی بەخشنەر بوو ، بەردەوام زەردەخەنەی لەسەر لێوان بوو !!!

- فاتیمەی کچی ئیمام فەرموویەتی : جارێکیان ماڵی صالحی برام سووتا و گشت کەل و پەلی لێ فەوتا کە نزخەکەی نزیکەی ٤٠٠٠ دینار بوو ، صالح وتی : سوێند بە خوا من غەمبار نیم لەسەر سووتانی ئەو کەل و پەلە ، بەڵکو غەمبارم لەسەر کراسێکی باوکم کە بۆ تەبەڕوك نوێژم تیا دەکرد ...

کە ئاگرەکە دامرکاوە بینیمان هەموو ماڵەکە سووتاوە تەنیا کراسەکەی ئیمام نەبێ !!

- عەلی کوڕی حسەن فەرموویەتی : جارێکیان ماڵمان سووتا و هەموو کتێبەکانم لەگەڵ سووتان تەنیا کتێبێك نەبێ کە بەدەستی ئیمامی ئەحمەد نوسراو بوو !!

# فەرموودەی زانایان دەربارەی ئیمامی ئەحمەد

- ئیمامی شافعی فەرموویەتی : ئەحمەد ئیمامە لە فەرموودە ... ئیمامە لە زمان ... ئیمامە لە دونیانەویستی ...
- ئیمامی ئیسحاقی کوڕی راهەوێ فەرموویەتی : ئیمامی ئەحمەد خزمەتێکی زۆری ئیسلامی کرد .
- عەلی کوڕی مەدینی فەرموودەناس فەرموویەتی : کەس وەکو ئیمامی ئەحمەد نیە لە بەهێزی لەبەر کردنی فەرموودە .
- ئیمامی ئەبو سەور فەرموویەتی : ئیمامی ئەحمەد مامۆستاو پێشەوامانە .
- ئیمامی دارِمی فەرموویەتی : تاوەکو ئێستا نەمبینیوە کەس وەکو ئیمامی ئەحمەد فەرموودەی لەبەر بێ .

- ئەبو حاتەمی رازی فەرموودەناس فەرموویەتی : ئەگەر بینیتان یەکێك ئیمامی ئەحمەدی خۆش دەوێ ، بزانن لەسەر رێبازی سوننە و جەماعەیە .
- ئەبو زورعەی فەرموودەناس فەرموویەتی : ئیمامی ئەحمەد هەزار هەزار فەرموودەی لەبەر بوو ( واتە یەك ملیۆن فەرموودە ) !!!!
- یەحیای کوڕی سەعیدی قەتتانی فەرموودەناس فەرموویەتی : تاوەکو ئێستا قوتبیەکی وەکو ئەحمەدم نەبینیوە !!!
- عەبدولڕەززاقی فەرموودەناس فەرموویەتی : هیچ کەسێکم نەبینوە لە تێگەیشتن و لەخواترسی وەکو ئیمامی ئەحمەد ، کەس نەهاتۆتە لامان لەو چاکتر بێ !!
- یەحیای کوڕی مەعینی فەرموودناس فەرموویەتی : کەس لە ژێر ئاسمان لە ئیمامی ئەحمەد تێگەیشتووتر نیە ، نە لە رۆژهەلات و نە لە رۆژئاوا !!
- ئەبو خەیسەمەی فەرموودەناس فەرموویەتی : کەسی وەکو ئیمامی ئەحمەدم نەبینیوە !!
- ئیبن ئەبی حاتەمی فەرموودەناس فەرموویەتی : پرسیارم لە باوکم کرد : کامەیان لە فەرموودە شارەزاتر بوون : ئیمامی ئەحمەد یان ئیمامی عەلی کوڕی مەدیەنی ؟

فەرمووی : وەکو یەك بوون ، بەلام ئیمامی ئەحمەد تێگەیشتووتر بوو !

- بۆشەنجی فەرموویەتی : کەسم نەدیوە وەکو ئیمامی ئەحمەد لە لەقل و زۆری زانست .
- ئیبن وارە فەرموویەتی : ئیمامی ئەحمەد خاوەن تێگەیشتن و لەبەر کردن و شارەزایی و زانست بوو .
- ئیمامی نەسائی فەرموویەتی : ئیمامی ئەحمەد زانستی فەرموودە و لەخواترسان و دونیانەویستی و ئارامی کۆکردبۆوە .

- ئیمامی ئەبو داوود فەرموویەتی : مەجلیسی ئیمامی ئەحمەد مەجلیسی قیامەت بوو ، بەهیچ شێوەیەك باسی دونیای تیا نەدەکرا ، هەرگیز گوێم لەو بەرێزە نەبووە باسی دونیا بکات !
- خەتیبی بەغدادی فەرموودەناس فەرموویەتی : ئیمامی ئەحمەد پێشەوای فەرموودەناسان و خۆڕاگر لە میحنەت و بەرگریکەر بوو لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بوو .
- ئیمامی عیجلی فەرموویەتی : ئیمامی ئەحمەد پیاوێکی باوەڕپێکراوی چاکی رەوشت پاکە ، بەردەوام لەسەر سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بوو .
- ئیمامی ئیبنولعیماد فەرموویەتی : ئیمامی ئەحمەد گەورەی ئوممەتی ئیسلامە و زانای سەردەمی خۆی بوو .
- ئیمامی زەهەبی فەرموویەتی : ئیمامی ئەحمەد گەورەی موسڵمانانە .
- ئیمامی سەخاوی فەرموویەتی : موسنەدی ئیمامی ئەحمەد لەهەموو موسنەدەکانی تر صەحیح و بەهێزترە .
- ئیمامی ئەبو نوعەیم فەرموویەتی : ئیمامی ئەحمەد پێشەوایەکی گەورەی خاوەن پلەیەکی بەرز بوو .
- ئیمامی ئەبو داوودی تەیالیسی فەرموویەتی : هیچ کەسێك لام خۆشەویستر نیە لە ئیمامی ئەحمەد .

# هەندێ لە فەرمموودەکانی ئیمام

ئیمام فەرموویەتی :

- پێویستە ئەم دونیایە کەم بێ بۆ داواکاری زانست ، ئەگەر زۆر بوو ... زانستەکەی دەبا !
- ئەگەر کەسێك خۆی نەناسێ ، مەدح کردنی خەڵك سوودی پێ ناگەیەنێ .
- هەر فەرموودەیەکم نووسی بێ کارم پێ کردووە ، تا وام لێهات فەرموودەیەکم نووسی کە پێغەمبەر ﷺ خوێنی خۆی گرتووە و دینارێکی دا بە خوێنگرەکە ، منیش ئاوام کرد و دینارێکم دا بە خوێنگرەکە .
- ترسی خوای گەورە وای لێ کردووم خواردن و خواردنەوەم نەمێنێ .
- هەر کاتێ مردنم دێتە یاد ، ئەم دونیا بەکەم دێتە پێش چاو .
- حەزم لێیە لە شوێنێکی وابم ، هیچ کەسێ نەمبینێ !.
- بەتەنیا مانەوە و خەڵوەت کردن ، حەوانەوەی دڵی منە !
- لەخوای گەورە داواکارم نەپاداشت و نەسزام لەسەر بڵاو کردنەوەی ئەم زانستە بداتەوە !!
- ئەگەر داوای پارەت کرد ، پشتت تێ دەکا ، ئەگەر پشتت تێ کرد بەخۆی داوات دەکات و دێتە ناو دەستت !!
- ئەگەر فەرموودە دەربارەی گەورەیی پاداشت و سەختی سزا بێ ، ئێمە زۆر لە ئیسنادەکەی ناکۆڵینەوە و توندی بەکار ناهێنین و ، ئەگەر بێ هێزیش بێ وەریدەگرین ، بەڵام ئەگەر لە حەڵاڵ و حەرام بوو ، ئەوا توندڕەوی تیا دەکەین و تەنیا صەحیحەکەی وەردەگرین !!
- با تەقوا هەردەم لە دڵت بێ و قیامەت لە پێش چاوت بێ !!!

# وەفات کردنی ئیمام

ئیمامی ئەحمەد دوای خۆرهەڵاتنی رۆژی جومعەی دوانزەی مانگی رەبیولئاخیری ساڵی ۲٤۱ی کۆچی لە شاری بەغدا وەفاتی کرد لە تەمەنی ۷۷ ساڵیدا ، دوای ئەوەی نۆ رۆژ لە نەخۆشیە کوشندەکەی بەسەر برد ، ئیمامی ئەبو بەکری مەروەزی چاوەکانی نووقاند و شۆردی ، ئینجا موحەممەدی کوڕی عەبدوللا نوێژی لەسەر کرد و لەدواوەی ۸۰۰۰۰۰ پیاو ۶۰۰۰۰ ئافرەت نوێژیان کرد، بەڵام ئەوانەی بە تەنیا نوێژیان لەسەر کرد لەگەڵ ئەوانەی سەرەوە ملیۆنێك و ۸۰۰۰۰ کەس بوون !!!
کە وەفاتی کرد هەموو خەڵکی شاری بەغدا گریان و ، زیاتر لە ۲۰۰۰۰ جولەکە و دیان موسڵمان بوون !!!

سەلامی خوات لێ بێ ئەی ئیمام ...
خوای گەورە پلە وپایە و ناوت بەرزتر بکات ...
ئەی گەورەی ئیمانداران ...
ئەی سەرداری زانایان ...
ئەی چاکترین فەرموودەناس ...
ئەی پێشەوای لەخواترسان ...
رەحمەت و فەزڵی خوای گەورە وەکو باران برژێ بەسەر قەبرەکەت ...
ئەی بەرگریکەر لە ئاینە پیرۆزەکەی خوا ...

# سەرچاوەكان

١ـ وفيات الأعيان / ابن خلكان .

٢ـ مناقب الأئمة الأربعة / ابو عبدالله المقدسي .

٣ـ شذرات الذهب / الإمام ابن العماد الحنبلي .

٤ـ الكواكب الدرية / العلامة عبدالرؤوف المناوي .

٥ـ تأريخ بغداد / الحافظ الخطيب البغدادي .

٦ـ تذكرة الحفاظ / الحافظ الذهبي .

٧ـ تدريب الراوي / الإمام السيوطي .

٨ـ مسند الإمام أبي حنيفة / تحقيق : صفوة السقا ـ الطبعة الأولى ـ ١٣٨٢هـ .

٩ـ أبو حنيفة / د. محمد يوسف موسى .

١٠ـ تأريخ جامع الإمام الأعظم / هاشم الأعظمي .

١١ـ شرح صحيح مسلم / الإمام النووي ـ الطبعة الرابعة ـ دار إحياء التراث العربي .

١٢ـ المختصر في أخبار البشر / أبو الفداء عماد الدين إسماعيل .

١٣ـ ضياء الصدور / ظاهر شاه ميان عبدالعظيم .

١٤ـ الخيرات الحسان / الإمام ابن حجر الهيتمي .

١٥ـ المستدرك / أبو عبدالله الحاكم ـ تحقيق : مصطفى عبدالقادر عطا ـ دار الكتب العلمية ـ بيروت ـ ١٤١١هـ .

١٦ـ كتاب الطبقات / خليفة بن خياط .

١٧ـ حلية الأولياء / الحافظ أبو نعيم .

١٨ـ تنوير الحوالك / الإمام السيوطي .

١٩ـ مشاهير علماء الأمصار / الحافظ ابن حبان .

٢٠ـ سنن ابن ماجه .

٢١ـ سنن النسائي .

٢٢ـ التذكرة / الإمام القرطبي .

٢٣ـ إحياء علوم الدين / الإمام الغزالي .

٢٤ـ المجموع / الإمام النووي .

٢٥ـ الأعلام / خيرالدين الزركلي .

٢٦ـ طبقات الشافعية / ابن هداية الله ـ تحقيق : عادل نويهض .

٢٧ـ الأم / الإمام الشافعي ـ تحقيق : محمد زهري النجار .

٢٨ـ الشافعي حياته و عصره / محمد أبو زهرة .

٢٩ـ ديوان الإمام الشافعي / تحقيق : إسماعيل يوسف .

٣٠ـ مغني المحتاج / الخطيب الشربيني .

٣١- مناقب الشافعي / ابن أبي حاتم .

٣٢- المجموع / الإمام النووي .

٣٣- توالي التأسيس / الحافظ ابن حجر .

٣٤- الطبقات الكبرى / الإمام الشعراني .

٣٥- تحفة الأحباب / الإمام السخاوي الحنفي .

٣٦- الوافي بالوفيات / صلاح الدين خليل بن أيبك الصفدي .

٣٧- أعلام العرب / عبدالصاحب الدجيلي .

٣٨- كشف الظنون / حاجي خليفة .

٣٩- الكواكب السائرة / نجم الدين الغزي .

٤٠- الجامع المختصر / ابن الساعي .

٤١- مناقب الشافعي / الإمام البيهقي .

٤٢- طبقات الشافعية / الإمام الأسنوي .

٤٣- ذيل تذكرة الحفاظ / الحافظ أبو الحسين الدمشقي .

٤٤- القول البديع / الحافظ السخاوي .